نـــاوی نووسـەر: موحەممەد حیشمەت

وەرگێڕان: ڕێکخراوی ئاستانە

پێداچوونەوە: ڕێکخراوی ئاستانە

دیزاینی ناوەوە و بەرگ: ڕێکخراوی ئاستانە

نۆبـەتـی چـــاپ: یەکـــەم ٢٠٢٢

تـیــــراژ: ١٠٠٠ دانــــــــە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( - ) ی ساڵی ٢٠٢٢ پێدراوە

# له سایەیی پەروەردەی پێغەمبـــــــــەردا (ﷺ)

(ئەزموونی خەوواتی کوڕی جوبەیر)

نووسینی

موحەممەد حیشمەت

وەرگێڕان:

ڕێکخراوی ئاستانە

# پێشەکی

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله صلى الله عليه وآله وصحبه وسلم، وبعد:

کاتێک بە فەزڵی خودای گەورە بۆم لووا کە وەستانێک لە خزمەت باسی «خەووات»دا بکەم ((ڕەزای خوای لێبێت)) بۆ یەکەم جار، پێشتر بە هیچ هەڵوێستەیەکی ژیان نەگەشتبووم ئەوەی نەبێت کە لە بابەتە بانگەوازییەکاندا بەرباس و ناسراوە، وەک ئاماژەیەک بۆ شێوازی مامەڵەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هەڵە، باسی ئەم هاوەڵە سەرنجی ڕاکێشام کە لەم سەردەمەماندا لەلای زۆرینەمان نەناسراو و شاراوەیە.

دواتر چووم بە دوایدا گەڕام، تووشی سەرسوڕمان بووم کە سەیری کتێبەکانی سیرەم کرد بۆم دەرکەوت کە (عبداللەی کوڕی جوبەیر) ئەمیری تیرهاوێژەکانی ڕۆژی ئوحود برای «خەووات»ە. لەو ئاماژە بچووکەوە بوو بۆم دەرکەوت کە «خەوات» برای «عبدالله»یە، پاشان دەستم کرد بە گەڕان بەدوای ژیاننامەی عبدالله دا و بینیم کە پۆلێنکەرەکان بە براکەی دەیناسێنن و کاتێک ناوی دەهێنن دەڵێن: عبداللەی کوڕی جوبەیر، برای خەووات!

ئەمە چییە؟! ئێمە لەبارەی عبداللەوە تەنیا ئاگاداری هەڵوێستەکەی ڕۆژی ئوحودین، زۆرجار لە پێشبڕکێکاندا پرسیار دەکرێت: "کێ ئەمیری تیرهاوێژەکانی ڕۆژی ئوحود بوو؟ عبداللەی کوڕی جوبەیر ..." تەنیا ئەوەندە. چۆن دەکرێت ئەم هاوەڵە بەڕێزە لەگەڵ ئەو ناوبانگە ڕێژەییەی کە لای ئێمە هەیەتی -لەگەڵ شاردنەوەیەکی ئەم حاڵەتەی خۆماندا-

لەلای زانایانی تۆمارکاری سیرە ناوبانگی کەمتر بووە لە «خەووات»ـی برای کە خەووات ئەسڵەن لای ئێمە نزیکە بە تەواوەتی نەناسراو بێت؟!

دەستم کرد بە کۆکردنەوەی زانیاری لەبارەیەوە، بۆ ئەوەی سەرەتا خۆم بیناسم و پاشان سوود بە جگە لە خۆشم بگەیەنم، بە هیوای پاداشتی ناساندنی یەکێک لە هاوەڵە بەڕێزەکان (ڕەزای خوایان لێبێت)، جا خۆم لە بەردەم زانیاریگەلێکی زۆروزەبەنددا بینییەوە کە یەک لە وێنەکانی مرۆڤێکی ڕێکوپێک و سرووشتی دەکێشێت.

بەڵێ، ئەمە یەکەم نیازم بوو، تەنیا بۆ ناساندنی و وەرگرتنی چەند وانەیەکی سادە لە ژیاننامەکەی، هەتا ئەوەی کە خوای گەورە منەتی ئەوەی خستە سەرم و ئیدی خەریکبوو دەمناسی، تا زیاتر دەستم دەبردە خوێندنەوە و ڕامان لە چیرۆکەکانی هاوەڵان و پێداچوونەوە بە گێڕانەوەکانیاندا لە پەرتووکەکانی فەرموودە و ئەسەر و هەڵوێستەکانیان کە لە پەرتووکەکانی ژیاننامە و تەفسیر و ئەوانەی دیکەشدا تۆمارکراون؛ ئەوەم بۆ دەرکەوت کە ئەو وانانەی لە ژیانی ئەوان و هەڵوێستەکانیانەوە فێری دەبیت، لە سایە و سێبەری پەروەردەی پێغەمبەردا (ﷺ) هەمیشە زۆر لەوە زیاترە کە من مەزەندەم کردووە لە تەنیا چەند وانەیەکی سادە و ئامۆژگاریگەلێکی خێرا.

بەڵێ! ئەوان پێوەر و مەحەک بوون بۆ هەموو ئەوانەی لە دوایانەوە دێن، هەر بۆیە دەبێت لەسەر هەر هەواڵێکی چەسپاو لێیانەوە بوەستین و ڕابمێنین، و بڕوانین لە هەڵسوکەوتیان لەناو خۆیاندا و هەڵسوکەوتی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵیاندا، وە چۆن لەگەڵ ژیان و بارودۆخە جیاوازەکان و خۆیاندا وە داخوازییەکانی واقیع و کۆمەڵگەکەیاندا مامەڵەیان کردووە.

لە «خەووات»ـەوە فێربووم کە هەوڵدانی بەردەوام بۆ گەشتن بە ئامانج، مانای ئەوەیە کە تۆ شایانی تووشبوون بە هەڵە -بێگومان- و لادانیت لە

ڕێگەکە، و دواتر دەوەستیت و خۆت ڕاست دەکەیتەوە، و ئەوجا دووبارە دەگەڕێیتەوە سەر ئەو شاڕێگەیەی کە دەتگەیەنێت بە ئامانج.

بێگومان دەبێت تووشی گوناهـ ببیت و تەوبەش بکەیت، شکست بێنیت و سەریش بکەویت ... بکەویت و دووبارە هەستیتەوە، ئەمە سرووشتی ژیانە، ئەمە سرووشتی مرۆڤەکانە.

فێربووم کە ڕێگەی گەڕانەوە هەمیشە وابەستەی هەنگاونان و کارکردن و بێئومێد نەبوونە و هەنگاونانی بەردەوام بۆ ئەو شتەی کە دەتەوێت، بە دڵنیاییەوە هەندێک مەیل بەلای لادانیشدا ڕوودەدات. خۆ ئەگەر بڵێیت: "نەخێر هیچ مەیلێک بۆ لادان نییە..." ئەوە یان وەهم و خەیاڵە، یاخود تۆ وەستاو و نەجووڵاویت و لە شوێنی خۆت نەبزووتووی!

لە ژیانی «خەوواتی کوڕی جوبەیر»م ڕووانی، لێی ڕامام و بۆم دەرکەوت کە زۆر ڕاستەقینە و زۆر مرۆڤانەیە ...

بەڵێ، دەستم کرد بە گەڕان بە دوای هەرچی شتێکدا کە لەبارەیەوە نووسرابوو، تێڕادەمام و دەمپشکنی بە ئومێدی دیتنەوەی ئەو ڕێگەیەی کە دەمویست، ڕێگەی گەڕانەوە بۆ لای خۆمان، بۆ ڕاستەڕێگە، بۆ ڕاستییە هەرە مەزنەکە، بۆ سایە و سێبەری پەروەردەی پێغەمبەری، وە هەوڵدان بە ئاڕاستەی بنیاتنانی مرۆڤێک کە ڕێکوپێک بیر بکاتەوە و ئازاد دەرببڕێت، وەک چۆن ئەو نەوە ناوازەیە وابوون کە بەهرەوەری ئەو سایە سالارە بوون، هیوام وایە کە دەستگیرۆ و ڕێنومایی کرابم بۆ هەندێک لەوە، خەستە نابم لەوەی هەردەم بە هیواوە وەک خوبەیب بیلێیمەوە:

.... ... ... ... وإنْ يَشَأْ

يُبارِك على أوْصالِ شلوٍ ممَزَّع

ASTANA

.... ... ... ... كە ئەگەر بیهەوێت

پیت و فەڕ لە ئەندامە لەتوپەتبوو و تێکشکاوەکانیش دەهاوێت

والحمد لله أولاً وآخراً.

**نووسینی:**

موحەممەد حیشمەت

٢٧/٢/١٤٤٢

هاووادەی: ١٤/١٠/٢٠٢٠ ز

قاهیرە، میسر

mhseada@hotmail.com

## سەرەتا

خۆری ئیسلام هێشتا هەڵنەهاتبوو ...

ڕۆژێک لە ڕۆژانی مانگی (ذي القعدة)، ئەو مانگەی کە بازاڕێکی گەورە لە خاکی نەجد بەرپادەکرا، پێی دەوترا: (بازاڕی عوکاظ) هاوڕێکەی ئێمە، گەنجێکی باڵاناوەند و شێوە ڕێکوپێک و جوان، بەرەو بازاڕ دەرچوو، لە ڕێگەدا چاوی بە کچێک کەوت کە ڕۆنی دەفرۆشت ... دەتگوت مانگە!

گەنج هەوڵدەدات لەگەڵیدا ڕاببوێرێت، بەڵام ئەو ڕەتیدەکاتەوە.

شەیتانەکەی فێڵێکی نایابی لە دڵ دەنێت تاکوو دەستی پێی بگات، کابرا دەگەڕێتەوە ماڵەوە و جلەکانی دەگۆڕێت، هەوڵدەدات شێوەی بگۆڕێت بۆ ئەوەی جارێکی دیکە بگەڕێتەوە لای کچە جوانەکە «فرۆشیاری ڕۆن».

جارێکی دیکە و بە شێوەیەکی دیکە!

لە کچە دەچێتە پێشەوە کە لە هەر دەستێکیدا هیزەیەک ڕۆنی هەڵگرتبوو، وا پیشان دەدات کە دەیەوێت بیکڕێت، پێی دەڵێت: ”ڕەنگە ڕۆنەکەت شتێکی تێکەڵکرابێت؟!“ کچە وەڵام دەداتەوە: ”کورە ئافرەتی سەنگین ڕۆن تێکەڵدەکات!؟“

دەڵێت: ”کەواتە دەچینە خوارەوە بۆ ناو دۆڵەکە، کە وشترەکەمی لێیە، بۆ ئەوەی تامی ڕۆنەکەت بکەم، ئەگەر بەدڵم بوو دەیکڕم... چونکە دەترسم وشترەکەم بەرەڵڵا بێت!“

کچی ڕۆژی پەیداکەر و پێداگر لەسەر ساغکردنەوەی شمەکەکانی، دەچێتە خوارەوە بۆ ناو ئەو دۆڵەی کە گەنجە دەڵێت، گەنج یەکێک لە هیزەکانی لەدەست وەردەگرێت تاکوو تامی ڕۆنەکە بکات ... و پیلانەکەش دەست پێدەکات!

تامی یەکەم دەکات، دەڵێت: "بەڵێ ئەمەیان تێکەڵ نییە"، پاشان هیزەکە بە دەمکراوەیی دەداتەوە دەستی بۆ ئەوەی ئەوی دیکە تام بکات و وەک چۆن تامی یەکەمی کرد ... پاشان ئەوی تریش بە دەمکراوەیی دەداتەوە دەستی، کچە دەڵێت: "بوەستە هەتا دەمی هیزەی یەکەم دەبەستمەوە!" گەنجەکەش -چۆن بڵێیت دەترسێت وشترەکەی دەرچێت و وونبێت- دەڵێت: "من وشترێکی سەرەڕۆم هەیە! بیگرە، وا وشترەکەم پەتی بڕی!"

کچە هەر دەڵێت: "ئارامبگرە هەتا یەکەم دانەیان دەبەستمەوە!"، ئەویش دەڵێت: "نا، بیگرە ئەگینا بەریدەدەمەوە هەمووی بڕژێت، دەترسم وشترەکەم نەدۆزمەوە"، جا وەختێک کچە دەترسێت هیزەکە لەدەستی بەربداتەوە و ڕۆنەکە بە زەویدا بڕژێت -کە قووتی خێزانەکەی بوو- هیزەی دووەمیشی لەدەست دەگرێت؛ ئەوجا هەردوو دەستی گیراوە!

ئیدی ئەم لاوەی سەردەمی نەفامی؛ توند کچە دەگرێت و کاری خۆی لەگەڵدا دەکات کە ئەو بە هەردوو دەست دوو هیزەکەی گرتووە، نەوەک بڕژێن، و بەرگرییەک لە خۆی ناکات، تەنیا هێندە دەڵێت: "دەک لێی نەحەسێیەوە و پیرۆزت نەبێت."

ئەویش شیعرێکی پێدا وت کە گاڵتە بە ڕەزیلی کچە دەکات و شانازی بە نێرێتی خۆیەوە دەکات. بێباکانە لەوەی چی کردووە، ئیدی ئەوا بووبوو بە پەند، کە دەوترا: «سەرقاڵتر لە کچەی خاوەن دوو هیزەکە!»، هەروەها

دەوترێت: «حەز وروژاوتر لە خەووات!».[١]

لەپاشان پەروەردگاری مەزنی میهرەبان ڕێگەی ئەم خەوواتەی سەردەمی نەفامی دەدات کە ببێتە موسڵمان.

## ناو و سیفەتەکانی

خەوواتی کوڕی جوبەیری کوڕی نوعمان (ڕەزای خوای لێبێت)، لە هۆزی ئەوس، و لە پشتیوانان بوو. ناوێک لەجێی خۆی، کە خەووات بەواتای: ئازا و بوێر دێت، کەسێک کە لە توخنکەوتنی هەر هەرا و هەورازێک بێباکە.[٢]

ئیبن فارس دەڵێت: « خاء و واو و تاء بنەچەیەکن بەواتای کار بردنەسەر و بەجێهێنانی پێشڕەوانە و بێباکانە دێت».[٣]

کەسێکیش کە لە ژیانی خەووات (ڕەزای خوای لێبێت) دەڕوانێت؛ دەبینێت کە ئەم سیفەتەی لە سەردەمی نەفامی و ئیسلامیشیدا تێدا بەرجەستە بووە.

ئەگەر چیرۆکی (کچەی خاوەن دوو هیزەکە) بخوێنیتەوە بەستە بۆ ئەوەی ڕاستگەڕان بەدیهاتنی ئەم سیفەتە برانیت: بوێرێک، کە لە توخنکەوتنی هەر هەرا و هەورازێکدا باکی نییە!

بەهەمان شێوەش کاتێک کە بەرگی نەفامی داکەند و خۆری ئیسلام بەسەر دڵیدا هەڵهات، ئەو سیفەتانەی لەسەر تەرازووی ئیسلام ڕاستبوونەوە و بوون بە بوێری لە حەقدا و خۆدان لەهەر سەختی و ترس

---

(1) ينظر: «مجمع الأمثال» للميداني (١/٣٧٦)، (٢/٦٧).

(2) انظر: «شمس العلوم»، للحميري (٣/١٩٤٨).

(3) انظر: «مقاييس اللغة» (٢/٢٢٥).

و سامێک لە پێناو خودادا، بەمجۆرە ئەو بوێری و بێباکییەی کە بەرانبەر بە مەترسییەکان هەیبوو، لە چەندین هەڵوێستی دواتری خەوواتدا دەردەکەوتن: «یەک لە ئازا و بەجەرگە بەرباسەکان» و، «یەک لە پاڵەوانە بەناوبانگاکان» و «یەک لە سوارچاکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)». وەک پەرتووکەکانی ژیاننامەکان باسی لێوە دەکەن.

ئەمە شتێکی سەیر نییە، چونکە ئیسلام بۆ ئەوە نەهاتووە سیفەتەکانی مرۆڤ بسڕێتەوە یاخود دووبارە درووستیان بکاتەوە، بەڵکوو ئامانجی ئەوەیە ئەو بەخشانەی خودا کە بە مرۆڤێک دراون، لەو شتانەدا بەکاریبهێنێت کە بۆی داندراوە.

چونکە دەکرێت هەمان سیفەت -سیفەتی بوێری بە نموونە- کە لە سێبەری کۆمەڵگە نەفام و لادەرەکاندا بۆ شکاندنی ناموس و ڕژاندنی بە ناهەقی خوێنەکاندا بەکاردێت، لەگەڵ ئەوپەڕی شانازیکردن خۆهەڵکێشانیش بەو کارانەوە، هەر خودی بنەڕەتی ئەو سیفەتەیە کە لەژێر سێبەری ئیسلام و حەقدا دەبێتە (سوارچاکێتی) و (ئازایەتی) و (پاڵەوانێتی) و (قوربانیدان) لەپێناو ڕزگارکردنی بەندەکان و ئاوەدانکردنەوەی زەوی و جەنگان لە دژی گەندەڵی.

هەر بۆیە کاتێک لەو بارەیەوە پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) کرا فەرمووی: «دەبینن کە خەڵکی وەک کانزاکان وان؛ باشترینیان لە نەفامیدا باشترینیانە لە ئیسلامدا، ئەگەر لە ئیسلام تێگەشتبن و حاڵیبن».

هەربۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤ -ئەگەر لە تاوان و سەرپێچییەوە هاتە سەر بەندایەتی و گوێڕایەڵی، یاخود لە ژیانی لادانەوە بەرەو ژیانی ڕاستەڕێچوون- بە پێچەوانەی سرووشت و خوخدەی خۆیەوە مامەڵە نەکات، بەڵکوو لەناو کانزا و خووڕەوشتی خۆیدا بگەڕێت و ئەو ڕەفتار و خووڕەوشت و توانایانەی هەیەتی لەو شتانەدا بەکاریبهێنێت کە لەگەڵ

ئیسلامدا دەگونجێن و خزمەتی حەق و ڕاستی و دادگەری دەکەن، نەک سەرجەم ئەو خوڕەوشت و توانایانە هەڵبوەشێنێتەوە تەنیا لەبەرئەوەی کە پێشتر لە خراپە و لاداندا بەکاری هێناون.

## بەرەو ئیسلام:

هەرچەندە لە پەرتووکەکانی سیرە چیرۆکی موسڵمانبوونی «خەووات»مان بۆ باس نەکراوە، بەڵام ئاماژەیەکی گرینگییان بۆ بەجێهێشتووین کە دەکرێت لەڕێیەوە بگەینە وێناکردنێکی گشتی. وەختێک زانایانی سیرە باس لەوە دەکەن کە یەکێک لەو کەسایەتییانەی ئامادەی پەیمانی (عەقەبەی دووەم) بوون بە نوێنەرایەتی هۆزی ئەوس؛ سوارچاکی جوامێر «ئەبو مونذیر عبداللەی کوڕی جوبەیر» بووە، برای دایکوباوکی ئەم هاوڕێیەی خۆمان خەوواتی کوڕی جوبەیر!

کەواتە؛ ئیسلام هەر زوو گەشتۆتە ماڵی ئەو پیاوە ئازا و بوێرانە لەگەڵ ئەو پۆلە پیرۆزە پێشەنگەی کە بەر لە کۆچ موسڵمان بوون، هەروەها لەگەڵ باڵیۆزی بە سام و مەزن «موصعەبی کوڕی عومەیر»دا (ڕەزای خوای لێبێت) کۆبوونەتەوە، بە شوێن ئەوەشدا عبداللەی کوڕی جوبەیر -برا گەورەکەیان- لەگەڵ شاندی ئەوسدا بەڕێکەوت بۆ پەیماندان بە موسڵمانێتی. خەوواتی[1] برا بچووکیشی لە یەثریب بەجێهێشت، تاکوو لەپاش ئەوە بگەڕێتەوە و ئەوەی ڕوویدا بۆی باس بکات و ئاگادارببنەوە بۆ دەستپێکردن بە ئامادەسازی بۆ پێشوازیکردن لە پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی کە بەم نزیکانە ڕوو لە مەدینە دەکەن.

---

(1) عبدالله بەتەمەن گەورەتر بووە لە خەوواتی برای، بڕوانە: «أنساب الأشراف» للبلاذري (٢٤١/١).

## ژیانێکی نوێ

لەپاش ڕێکەوتننامەی عەقەبە، کۆچکردووان پۆل پۆل دەهاتن بەرەو مەدینە، دوای گەشتێکی پڕ ترس و بۆسە، هەروەها پاش ئەوەی ماڵ و سامانیان لەدەستدا و نیشتیمان و بازرگانییەکانیان بەجێهێشت، تەنیا لە پێناو کۆچکردن بەرەو پەروەردگار ...

لە مەدینەش پشتیوانان لەوپەڕی ئامادەباشیدا بوون بۆ پێشوازیکردن و نیشاندانی تەواوی برایەتی ئیمانی وەک پێویستە، جا لە ماڵەکانی خۆیاندا نیشتەجێیان کردن و ماڵ و سامانیان لەگەڵدا بەش کردن وەکوو خۆیان کە خاوەنین، تەنانەت پێشیانخستن بەسەر خۆیاندا بەشێوەیەکی مەزنی وەها کە قورئان بۆخۆی تۆماریکردووە، کە پەروەردگار لەبارەیانەوە دەفەرمووێت:

﴿يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌۚ﴾ [الحشر: ٩].

واتە: «ئەوانەی کە پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادە کرد بۆ پێشوازیی لە کۆچکەران و دڵ و دەروونی خۆیان ڕازاندەوە بە ئیمان، ئەوانەشیان خۆش دەوێت کە کۆچیان کردووە بۆ لایان و لە دڵ و دەروونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسوودی و بەخیلیەک نابێتەوە (لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران دراوەو بەشی ئەوان نەدراوە) وە براکانیان دەخەنە پێش خۆیان هەرچەندە خۆشیان ئاتاج و هەژار بن و پێویستییان هەبێت.»

یەک لەو پێشەنگانەش کە ئاوا براکانیان خستبووە پێش خۆشیانەوە و پێشوازییان لە کۆچبەران کرد لە ماڵەکانیاندا: خەووات بوو (ڕەزای خوای لێبێت)، کاتێک لە ماڵەکەیدا پێشوازی لە یەکێک لە باشترین و بەڕێزترینی هاوەڵان و لەخواترسترینیان و ئازیزترینیان لەلای پێغەمبەری خودا (ﷺ) کرد، سەرداره دەوڵەمەندە لەخواترسەکە، دۆستە دونیانەویستەکەی خودا،

ئەبو سائیب «عوثمانی کوڕی مەظعون» لەگەڵ خێزانەکەیدا «خەولەی کچی حەکیم» (ڕەزای خوایان لێبێت).(١)

بەو شێوەیە مانەوە تاوەکوو موسڵمانان هەواڵی کۆچکردنی پێغەمبەری خودایان بیست (ﷺ) لە مەککەوە، ئیتر هەموو بەیانییەک بەڕێدەکەوتن بەرەو کەنارەکانی مەدینە و لەوێ چاوەڕوان دەبوون هەتا گڕەوگەرمای نیوەڕۆ دەیگەڕاندنەوە، ڕۆژێکیان لەپاش ئەوەی چاوەڕوانی درێژەی کێشا گەڕانەوە، کاتێک گەشتنەوە ماڵەکانیان؛ پیاوێک لە جوولەکەکان بۆ ئەنجامدانی هەندێک لە پێویستییەکی بەشوێنێکی بەرزدا سەرکەوت و پێغەمبەری خودا (ﷺ) و هاوەڵانی لە دوورەوە بینی سپی دەکەنەوە و تراویلکەکە دەڕەوێننەوە، جا زانی کە ئەوە پێغەمبەر خۆیەتی (ﷺ)، خۆی بۆ نەگیرا و یەکدەنگ هاواریکرد: "هۆ کۆمەڵانی عەرەب! ئەوە مەزنەکەتانە کە چاوەڕوانی بوون!"

موسڵمانان ورووژەیان کرد و چەکەکانیان هەڵگرت و جمەی تەکبیر دەهات، تەکبیریان دەکرد لە خۆشی گەیشتنی (ﷺ)، دەرچوون بۆ گەشتن بە دیداری، پێی شادبوون و بەخێرهاتنیان کرد، لە دەوری خڕبوونەوە، کە ئارامی پێغەمبەری داپۆشیبوو (ﷺ)، مەدینە هەمووی هاتبوو بۆ پێشوازی لێکردنی، ڕۆژێکی لەیادنەکراو بوو کە مەدینە هەرگیز ڕۆژێکی وەهای لە مێژووی خۆیدا نەدیبوو.(٢)

وادیارە بابەتی پێشوازیکردن لە کۆچکردووان لەپاش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) دووبارە ڕێکخرایەوە، وەکوو ئەوەی لە بوخاریدا هاتووە لە گێڕانەوەی «ئوم عەلائی ئەنصاری» کە: «عوسمانی کوڕی مەظعونیان بۆ دەرچوو کە

---

(1) انظر: «بهجة المحافل» للعامري (١٥٩/١).

(2) ئەوەی ماوەتەوە لە دیمەنەکە لە ئەڵقەی «الرميصاء. . في ظلال التربية النبوية»دا ببینە، هەمان نووسەر، دار المعرفة.

لەلایان بمێنێتەوە، کاتێک پشتیوانان تیروپشکیان کرد بۆ لەخۆگرتنی کۆچکردووان و نیشتەجێکردنیان لەماڵەکانیاندا. پاشان عوسمان وەختێک لەلامان بوو نەخۆشکەوت و منیش (پەرەستاریم کرد) هەتا ئەوەی کە کۆچی دوایی کرد ...».[١]

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: چۆن «خەووات» پێشوازی لە «عوسمان» کردووە لەکاتێکدا کە «ئوم عەلاء» دەڵێت کە تاوەکوو کۆچی دواییکردووە لەلای ئەوان ماوەتەوە و ئەو فەرموودەیەش لە صەحیحی بوخاریدا چەسپاوە؟ بەشێوەیەکی ڕوونتر: ئایا «عوسمان» لەلای «خەووات» مایەوە یاخود «ئوم عەلاء»؟

وەڵامی ئەم پرسیارە بە کۆکردنەوەی ئەو بۆچوونانە دەبێت وەک لێرەدا ڕوونمانکردەوە، کە وادیارە سەرەتا «عوسمان» لەلای «خەوواتی کوڕی جوبەیر» ماوەتەوە، پاشان کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتە مەدینە و پشتیوانان لە کێبڕکێدا بوون و بۆ پێشوازیلێکردن و چاودێریکردن لە براکانیان تیروپشکیان کرد، بەوشێوەیە تیروپشکەکە بۆ «ئوم عەلاء» دەرچوو وە «عوسمان» لەلای ئەوان ماوەتەوە تاوەکوو کۆچی دوایی کردووە. بەو شێوەیە پێگەو ڕێزی پێشوازیکردن و چاودێری کردن لە سەرەتادا بۆ «خەووات» بوو و لە دواییشدا بۆ «ئوم عەلاء»، واللّٰه أعلم.[٢]

---

(1) انظر: البخاري (٣٩٢٩)، كتاب «مناقب الأنصار»، باب «مقدم النبي (ﷺ)، وأصحابه المدينةَ».

(2) ئوم عەلاء، دەوترێت خێزانی زەیدی کوڕی ثابیت بووە ڕەزای خوایان لێبێت، ئەم فەرموودەیەش کوڕەکەی لێوەی گێڕاوەتەوە: خاریجەی کوڕی زەید. گەورەشمان عوثمانی کوڕی مەظعون، لە شەعبانی شاڵی ٣ک دا وەفاتیکردووە، هەڵوێستگەلێکی زۆر قەشەنگو ناوازەشی هەن، خودا یارمەتیدەر بێت وەفاداری و نووسینێکمان لە خزمەت ئەویشدا هەبێت.

## تاقیکردنەوەیەک هەر لە سەرەتای سایە و سێبەرەکەوە:

«خەووات» موسڵمان بوو، چووە سەر ڕێگەی ڕێنومایی و پابەندبوون و هەمیشە هەوڵیدەدا ئەو ڕۆژە ڕابردووانە لە بیر خۆی بەرێتەوە کە تێیدا شەل و کوێرانە دەکەوتە هەر خراپەیەکەوە، دوور لە ڕێگەی هیدایەت، موسڵمان بوو و بەشداریکرد لەو کارە چاکانەی کە کۆتا دانەیان ئێمە باسمانکرد؛ چاودێریکردنی برا کۆچکەرەکانی و هاوسۆزیکردن و میوانداری لێکردنیان بوو لە نێو ماڵی خۆیدا، لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) هات، «خەووات» ئیدی لەگەڵ ئەودا دەستی کرد بە ئامادە باشی بۆ ژیانە نوێیەکەی ...

بەڵام ئەمە هەمووی نییە؛ ژیانی (دونیا) بەم نەرمییە بەڕێوەناچێت بەبێ کۆمەڵێک تاقیکردنەوە کە پاداشت و ماڵ و لانەی ژیانی "ڕاستەقینە"ـی دوارۆژی لەسەر بێت، هەر لەبەر ئەمەیە کە هەمیشە پرسیارە قورئانییەکە دەبینیتەوە کە لە وێنەی پرسیاری نکۆڵیدا تێگەشتنی خەڵک بۆ چەمکی باوەڕ دەهەژێنێت، کەوا وابیردەکەنەوە ئیمان تەنیا وشەیەکە بە زمان دەردەبڕدرێت و تەواو ﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ﴾ [العنكبوت: ٢]

واتە: «ئایا خەڵکی وایانزانیوە، وازیان لێدەهێنرێت هێندەی بڵێن ئیمان و باوەڕمان هێناوە، و ئیدی تاقینەکرێنەوە و ناخۆشی نەبینن -لە بێژینگ نەدرێن!-»

نەخێر، ئەمە نە سرووشتی ئیمانە و نە ڕێسای خوداشە لە ژیاندا. ئەوە بەس نییە کە خەڵک بڵێن باوەڕمان هێنا، و تەنیا بەو بانگەشەیەش وازیان لێ ناهێندرێت، هەتاکوو ڕووبەڕووی تاقیکردنەوە و ئاشووب و چەرمەسەری نەبنەوە، پێچەسپاو نەبن تێیدا و بە پێکهاتەیەکی ڕوون و دڵێکی پوختەوە لێی دەرنەچن، هەروەک چۆن ئاگر ئاڵتوون دەسوتێنێت و پاکی دەکاتەوە لەو مادده دزەکردوو و هەرزان و بێنرخانەی کە لکاون بە کانزا ڕەسەنە

گرانبەهاکەوە، ئەم تاقیکردنەوانە لەسەر باوەڕ بنچینەیەکی چەسپاو، و ڕێسایەکی جێگیرە لە تەرازوی خودای بەرز و بێگەرددا ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَـٰذِبِينَ﴾ [العنكبوت: ٣]

واتا: «سوێند بێت بێگومان ئێمە ئەوانەی پێش ئەمانیشمان تاقیکردووەتەوە، سا سوێند بێت پەروەردگار بەدەریان دەخات، ئەوانەیان کە ڕاستاڵ بوون و دەریان دەخات ئەوانەشی کە درۆیانکردووە.»

«خەووات» لە بارەی خۆیەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: موسڵمان بووم و پێغەمبەر (ﷺ) کۆچیکرد بۆ لامان، جارێکیان کە من بە نێو کۆڵانەکانی مەدینەدا دەڕۆشتم چاوم بە یەک لە ئافرەتە داوێنپیسەکانی سەردەمی نەفامی کەوت کە ئەوکات دۆستم بوو، جا موسڵمان بوونەکەم ڕێگری لێدەکردم و نەفسیشم بانگی دەکردم بۆ لای، منیش چاوم لەسەری لانەبرد تاوەکوو خۆم کێشا بە دیواری ماڵی بەنی جەذرە دا، ڕوخسارم برینداربوو و خوێنی پێدا هاتەخوارەوە، بەو حاڵەوە چوومە لای پێغەمبەر (ﷺ)![١]

فەرمووی: چیت لێ هاتووە؟ منیش باسەکەم بۆ گێڕایەوە. جا فەرمووی: "سا نەگەڕێیتەوە سەری، گەر خودا چاکەی بۆ بەندەیەک بوێت لەم دونیا سزاکەی بۆ پێشدەخات."[٢]

ئایا سەرنجتدا کە «خەوات» چۆن ئاگادارمان دەکاتەوە هەر لە

(1) انظر: «المنتظم»،( لابن الجوزي (٥/١٧٠

(2) لە فەرموودەی ئەنەسەوە لەلای تورموذی و جگە لەویشەوە هاتووە بەبێ ناوهێنانی خەووات، لەلای ئیبن عەدی-ش لە «الكامل» دا لە فەرموودەی ئەبو هورەیرەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) برینێکی لە ڕوخساری کابرایەکدا دیت، فەرمووی: ئەوە چییە ڕوخسارت بۆ وای لێ هاتووە؟ گوتی: تەماشای ئافرەتێکم کرد و چاوم لە شوێنی بوو هەتا دیواری بەنی فڵان لە ڕوخسارم کەوت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: «خودا ئەگەر چاکەی بەندەیەکی بوێت سزاکەی بۆ پێشدەخات لە دونیادا».

سەرەتاوە هەتا کاتی ڕووداوەکە، کە چۆن لەسەرەتای گرتنەبەری ڕێگەی ڕێنوماییدا و پاش کۆچ کردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ لایان ئەوە ڕوویداوە، ئەوجا دەڵێت: «جارێکیان کە من بە نێو کۆڵانەکانی مەدینەدا دەڕۆشتم چاوم بە یەک لە ئافرەتە داوێن پیسەکانی سەردەمی نەفامی کەوت، کە ئەوکات دۆستم بوو»!

پاک و بێگەردی بۆ خوا، ئێستا و لەم کاتەدا؟!

تەنیا کەمێک بەر لە ئێستا بوو کە بەرگی نەفامی دادەکەند و پێیەکانی لە تەپوتۆزی نەفامی دەتەکاند لەپێناو هەڵبژاردنی ڕێگەی ڕاست و هەنگاونان بەرەو لای پەروەردگار.

کەچی ڕاست لێرەدا ئەم تاقیکردنەوەیە دێتە پێشەوە!

بەڵێ، ئەمە سرووشتی ڕێگەکەیە. وا نەزانیت کە بە هەڵبژاردنت بۆ ڕێگەی هیدایەت هەموو دونیا بە گوڵ ڕادەخرێت لە خۆشی گەڕانەوەی تۆدا، بەڵکوو ڕێک بە پێچەوانەوەیە: زەوی هەمووی دەبێت بە دڕک! دەزانیت بۆ!؟

زۆر بەکورتی و پوختی: «تاوەکوو بەرچاوڕۆشن بیت بە ڕێگەکە و فێری خۆپارێزی و لەخواترسان بیت.»

بەڵێ، لە خاڵی لاوازتدا تاقیدەکرێیتەوە، تاقیکردنەوەکان لە ناوچەکانی ترس و حەزەکانەوە بۆت دێن!

«خەووات» دەفەرمووێت: ”ئیسلامەکەم ڕێگری لێکردم و نەفسیشم بانگی کردم بۆ لای“. ئایین ئاوەها ڕێگری دەکات لە تاوان و دەیگێڕێتەوە، و نەفسیش بەئاڕاستەکەی دیکەدا بانگ و هاواری لێدەکات. جا بۆیە لەو وتەیە ڕابمێنە کە دەفەرمووێت: ”نەفسیشم بانگی کردم بۆ لای!“

ASTANA

دڕندەترین دوژمن لەدوای شەیتان، بانگی دەکات بۆ ئەو شوێنەی کە لە ڕۆژی موسڵمانبوونیەوە لێی هەڵدێت.

بەڵێ، ئەو لە سەرەتای تاقیکردنەوەدا دەرچوو، ئیسلامەکەشی لە کەوتنە پیسی و خراپەوە پاراستی، بەڵام بەو تازەییانە لە نەفامی دەرچووە، هێشتاش «(نەفسی» بانگی دەکات... هێشتا سەرقاڵە بە جڵەوگیرکردنی سرووشتە سەرەڕۆکەیەوە... تاوەکوو ئێستاش ئاوڕی لێ دەداتەوە، وەک ئەوەی لە جەنگێکدا بێت لە نێوان ئایینەکەی کە دەیگەڕێنێتەوە سەر ڕێگەی ڕاست و ئەو نەفسەی کە ڕایدەکێشێت بۆ ئەو ڕابردووەی کە لێی هەڵدێت. جارێک ئایینەکەی ڕایدەکێشێت، جارێکیش نەفسی، تاکوو دیوارەکە بە زللەیەک لە ڕوخساریدا ئەو ململانێیە یەکلادەکاتەوە، خوێن دەپژێت و ڕوخساری دەڕووشێت، جا بەو حاڵەوە دەچێتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و بۆی باسدەکات، ئەویش پێی دەفەرمووێت: "سا نەگەڕێیتەوە سەری، خودا گەر چاکەی بەندەیەکی بوێت لەم دونیا سزاکەی بۆ پێشدەخات".

بەڵێ، پێغەمبەر (ﷺ) هیچ توندی بەرانبەر بە «خەووات» بەکارنەهێنا... پێی نەفەرموو: هێشتا لەسەر بەزمی خۆت ماویت؟! ئەوەت بەس نەبوو کە لە نەفامیدا کردت؟ مەگەر موسڵمان نەبوویت؟! تەنانەت لە شارێگەی حەقیشدا هێشتا نەفست بانگت دەکات؟

هیچ کام لەوانەی نەفەرموو (ﷺ) ...تەنیا فەرمووی: سا نەگەڕێیتەوە سەری، پاشان ئاگاداری کردەوە لەوەی کە پەروەردگار میهری پێ نواندووە کە سزاکەی بۆ پێش خستووە، فێریدەکات کە ئەوە «سزا» بوو، بەڵام سزایەک لە توێی میهری خودادا، پەروەردەی پێغەمبەر (ﷺ) بەم شێوازە بووە، نە تەنیا یەک وێنە و یەک شێوازی چەقبەستوو.

پێدەچێت بپرسیت: مەگەر موسڵمان نەبووبوو؟ هێشتا لەپاش هەموو

ئەوە لە تاقیکردنەوە دەرنەچوو؟ مەگەر شایەنی پیرۆزبایی لێکردن و مزگێنی پێدان نەبوو؟

لە ڕاستیدا ئەو لە ڕێگەیدایە بەرەو سەرکەوتن...بەڵام تاقیکردنەوەکە هێشتا تەواو نەبووە، بارودۆخی «خەووات» پێویستی بە چاودێری کردنێکی پێغەمبەرانەی زیاتر بوو، کە بەشێکی ئەو چاودێریکردنەش لە ڕێگەی بەرەو بەدردا بوو.

## ڕێگەی بەرەو بەدر

«خەووات» لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بۆ جەنگی بەدر دەرچوو هاوشانی کۆمەڵێک هاوەڵی دیکە، زۆرێک لە هاوەڵان پێیان وابوو ئەم دەرچوونە تەنیا وەک تاقمێکی هەواڵگری و کنە و پشکنین دەردەچێت هاوشێوەی دەرچوونەکانی پێشتری پێش غەزاکە، هەر بۆیە هەندێکیان لە مەدینە مانەوە و پێغەمبەریش (ﷺ) زۆری لە کەس نەکرد بۆ دەرچوون، و بژاردەی دایە دەست خۆیان.

«خەووات» دەستپێشخەری کرد بۆ دەرچوون کە ئەمەش هاوڕێکی سیفەتەکانی بوو کە دیارترینیان بوێری و پێشڕەوی بوون کە ئیسلام ڕازاندنیەوە و کردنی بە قارەمانێتی و ئازایەتی و سوارچاکێتی لەڕێگەی خوادا.

لە ڕێگەدا «خەووات» قاچی بەردی پێ کەوت و شکا و هەڵئاوسا، پێغەمبەریش(ﷺ) گەڕاندییەوە بۆ ناوچەی (ڕەوحاء) کە لەو وێستگە سەرەکییانە بوو کە قافڵە دەرچووەکان لە مەدینە پێیدا تێپەڕدەبوون، و هەشتا کیلۆمەتر لەوێوە دوور بوو.

لەبەرئەوەشی کە «خەووات» بەمەبەستی غەزا دەرچوو، بەڵام بەهۆی پێکانەوە پێغەمبەر (ﷺ) گەڕاندییەوە، پێغەمبەر (ﷺ) لە دەستکەوتەکان پشکی خۆی بۆ دانا، لە ئەجر و پاداشتیتشدا بەهەمان شێوە حوکمی هاوەڵێکی «بەدری» هەیە با بە خودی خۆشی نەچووبێتە ناو جەنگەکەوە.

ئەوەی جێگای سەرنجە لێرەدا ئەوە بوو کە «خەووات» هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بوو لەسەر پشتی وڵاغەکەی.

ئەوەشی کە پێغەمبەر (ﷺ) هاوەڵانی لەپشت خۆیەوە سەردەخست شتێکی جێ سەرنج و شایانی لێڕامانە، کە جۆرێکە لە زیاد ئاوەڵێتیکردن و گرنگیپێدان لەلایەن پەروەردەکاری یەکەمەوە. ئەم ڕەفتارە تەنیا لەبەر نەبوونی سواری و شمەک و جێگە نەبووە، بەڵکوو هەروەک لە «ئەنەسی کوڕی مالیکەوە» گێڕدراوەتەوە، دەفەرمووێت: "پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێک دەکەوتە سەر سەفەر هەر ڕۆژە و پیاوێک لە هاوەڵانی لەگەڵ خۆیدا سەردەخست".[١]

جا پەروەردەکاری پێشەنگ حاڵ و توانای زەینی هاوەڵانی و پێویستییە دەروونییەکانیانی پێ دەزانێت، بۆیە هەرچی بۆیان گونجاوبووایە و سوودی بۆیان هەبا بۆی هەڵدەبژاردن و ئەوەی پێشکەشدەکردن. جا دەبینیت یەک لە جارەکان پێغەمبەر (ﷺ) «جابری کوڕی عەبدوڵڵا» لەگەڵ خۆیدا سەردەخات، کە زۆر حەزی بە زانست و فەرمودە بووە، ئیدی هەر لەو شەوەدا حەفتا فەرموودەی لە زاری پیرۆزیەوە لەبەرکرد[٢]، جارێکی دیکە «شەریدی کوڕی سوەید» لەگەڵ خۆیدا سەردەخات، جا لێی دەپرسێت: هیچت لە شیعری (ئومەییەی کوڕی ئەبی صەلت) لەلایە؟ گوتم: بەڵێ. فەرمووی: بێنە! (شەرید) دەڵێت، جا منیش یەک بەیتم گوت، فەرمووی:

---

(1) ینظر: «أسامي أرادف النبي»، لابن منده (ص١١)

(2) انظر: «تاريخ دمشق» لابن عساكر (١١/٢٣٠) (٢٧٩١).

«بێنە»! ئەوجا بەیتێکی دیکەشم گوت، فەرموویەوە: «بێنە»! هەتاکوو سەد دانە بەیتم بۆ گوت.(١)

بەمشێوەیە بۆ هەر یەکێک و ئەوەی پێی هۆگرە و بۆی گونجاوە، هەر کەسەش حاڵ و خوخدە و هەواداریێتی تایبەت بەخۆی هەیە، مرۆڤەکان تەنیا چەند قاڵبێکی چەسپاو نین، چوونەنێو هەندێکیش لە دڵەکانەوە و کارتێکردنیان پێویستی بە زیاد گرنگیپێدان و نزیکبوونەوە و گەشاندنەوە و گەشتن بە قووڵاییەکانی دەروون و ناسینی حاڵەتەکانی هەیە، سا بانگەوازی بێگومان کە دەبێت لەسەر چاورۆشنی و ناسینی حاڵ و پێویستی جیاجیای ئەو خەڵکە بچێت بەڕێوە. ئای چەندێک فەرموودەی پەروەردەیی بەنرخ و ئامۆژگاری سۆزبارێن هەن کە فەرموودەکانی هاوەڵێتی سەر پشتی سوارییەکی پێغەمبەر (ﷺ) بۆیان هەڵگرتووین، کە زۆر جار بەوە دەستپێدەکات "جارێک لە پشت پێغەمبەرەوە (ﷺ) سەرکەوتبووم، جا فەرمووی:". ....».(٢)

## خەووات لە ئوحوددا

ڕۆژەکان خێرا تێپەڕبوون لەپاش بەدر، قوڕەیشیش چاوەڕێی ئەو ڕۆژە بوون کە شان و شکۆی خۆیان بێننەوە و تۆڵە بستێننەوە، بڕیاری یەکلایان دابوو کە لەلای زنجیرە چیایەکی زەبەلاح بەناوی ئوحوود ڕووبەڕووی موسڵمانان ببنەوە.

---

(1) انظر «مسلم» (٢٢٥٥).

(2) فەرموودەکانی سەرکەوتنی لەپشت پێغەمبەرەوە (ﷺ) بەڕاستی جێگای لێڕامان و کۆکردنەوە و گرنگیپێدانن، خوای گەورە ئاسانی بکات بۆ کەسێک کە بەو ئەرکە هەڵدەستێت.

لەو وەختانەدا پێغەمبەر (ﷺ) خەونێکی بینی کە بۆ هاوەڵانیشی گێڕایەوە: «سوێند بە خوا من خێرم بینی، بینیم کۆمەڵێک مانگا سەردەبڕدران، بینیم لە لێوی شمشێرەکەمدا کەلێنێک هەبوو! و بینیم کە دەستم خستبووە ناو زرێیەکی قایم و تۆکمەوە!»

پێغەمبەر (ﷺ) خۆی خەونەکەی لێکدایەوە ...

مانگاکان: کۆمەڵێکن لە هاوەڵانی کە دەکوژرێن ... کەلێنی سەر شمشێرەکەشی پیاوێکە لە ماڵ و خانەوادەی خۆی کە ئەویش پێوە دەبێت، زرێ قایم و تۆکمەکەشی بە «مەدینە» لێکدایەوە.

ئەوجا ڕای خۆی پێشکەش بە هاوەڵانی کرد کە لە مەدینە نەچنە دەرەوە و هەر لەوێدا خۆیان قایمبکەن، خۆ ئەگەر موشریکان لە دەرەوەیدا بمێننەوە؛ نشینگەی سەخت و سامناک و بێهوودە کۆڵیان پێدەدات و دەڕۆن.

ئەگەریش بێنە ناو مەدینەوە موسڵمانان لە کەناری هەر کۆڵانێکدا لەگەڵیان دەجەنگن، ئافرەتانیش لەسەر ماڵەکانەوە، وەک شێوازی بۆسە و جەنگی پارتیزانی و ئەوەی بەم تازانە پێیدەڵێن «شەڕی کۆڵان بە کۆڵان»... پلانێکی تۆکمە!

بەڵام پەروەردگار وەختی شتێکی ویست هۆکارەکانی دێنێتە پێش و دەیانڕەخسێنێت...

گرۆیەک لە هاوەڵانی ماقووڵ لەوانەی کە دەرچوونی ڕۆژی بەدریان لەدەستچووبوو هەستان، ئەوەیان بە پێغەمبەر (ﷺ) ڕاگەیاند کە پێویستە هەر دەربچین، زۆریشی لەسەر چوون، هەتا ئەوەی کە یەکێکیان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە هەر ئاوات و داوای ئەم ڕۆژەمان لە خوا بوو، ئەوەتا بۆی هێناین و ڕێگەکەشی نزیکبووەتەوە، بۆ دوژمن دەردەچین، با واشنەزانن لێیان ترساوین.

کەواتە دەرچوونە و دەرچوون.

هاوەڵان بەخۆیاندا چوونەوە و وایاندی کە پێغەمبەریان (ﷺ) لەسەر بۆچوونێک هەڵپێچاوە کە خۆی بەدڵی نییە، جا قسەیان لەگەڵ کردەوە کە لە کۆتاییدا ڕا ڕای تۆیە و ئێمە تەنیا شوێنت دەکەوین، ئەویش پێی ڕاگەیاندن کە کار لێبۆتەوە و بۆ هیچ پێغەمبەرێکیش لە پێغەمبەرانی خودا نییە کە بەرگی جەنگ و زرێی شەڕ بپۆشێت و دواتر دایبکەنێت هەتا خودا لەگەڵ دوژمنەکەیدا یەکلای نەکاتەوە ... هەر واش بوو.

پێغەمبەر (ﷺ) بەوانەوە کە لەگەڵیدا بوون دەرچوو، گەشتنە نزیک ئوحود...تەواو نزیک بەجۆرێک کە هەردوو بەرە لێک دیار بوون و یەکیان دەبینی، دەمسپی و سەرکردەی دووڕووان «عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول» بە جووڵە فێڵبازانەکەی خۆی هەستا و ئاشووبێکی سازاند و بە نزیکەی سێیەکی سووپاکەوە کشایەوە!

سێسەد جەنگاوەر بۆ دەرەوەی جەنگەکە لەناو تەنیا نزیکەی هەزار جەنگاوەردا!

سێیەک کشانەوە...و سێیەکیش زۆرە.

«ئیبن سەلوول» بەناویاندا هاواری دەکرد: ئاخر نازانین بۆچی خۆمان بەکوشتدەدەین؟!

گەڕایەوە بۆ مەدینە گوایە لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆچوونەکەی[1] خۆی لەبەر کۆمەڵێک گەنج بەرداوە و بە قسەی ئەوانی کردووە.

---

(1) هەر بەڕاستیش پێشتر ئەو هاوڕایی دەربڕیبوو بۆ بۆچوونەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەرنەچن، بەم ئاشووبەیەشی بەدەرکەوت کە هاوڕابوونەکەی ئەو وەختی لەبەر ئەوە نەبوو کە لەڕووی جەنگییەوە ئەو بۆچوونە ڕاستترە، بەڵکوو بۆ ئەوە بوو کە بەبێ ئەوەی کەس تێبینی بخاتەسەر خۆی لە جەنگ لابدات، بەڵام خوا بۆخۆی ویستی لێبوو پەردەی لەسەر هەڵماڵێت.

کەواتە: چۆن دەکرێت یەک پیاو یاخود مشتێک لەوان ئەم ژمارە زۆرە بهەژێنێت؟!

وەڵامی ئەمە لە ئاشووبی ناوخۆییدا ئەوەیە کە خەنجەرەکە لەلای ئەوانەوە بۆت بێت کە لە ڕیزی خۆت دان، شەیتان ئاسایەکی بە وەسوەسە و تەڵەکە بێت و لە پێستی خۆتدا و بە زمانی خۆت بدوێت کە گوایە ئەویش ویستی پاسەوانیکردن لە ڕێبازی تۆی هەیە.

جا لە سەرەتاوە لەگەڵت دەکەوێتەڕێ، ئەوجا -لەپاش ئەوەی کە هەژمارتکردووە و بە بەشێک لە خۆتت داناوە- وازتلێدێنێت بۆ ئەوەی لاواز و بێ وورەت بکات لەوانەشە ئەسڵەن هەوڵبدات بۆچوون و باوەڕی ئەوانەشی هێشتا لە ڕیزی تۆدان بلەرزێنێت و درزی تێبخات سەبارەت بە کەیسەکە، کە شێوازێکی دێرینە و هەر زوو قورئان هۆشیاری لێ داوە: ﴿وَقالَت طائِفَةٌ مِن أَهلِ الكِتابِ آمِنوا بِالَّذي أُنزِلَ عَلَى الَّذينَ آمَنوا وَجهَ النَّهارِ وَاكفُروا آخِرَهُ لَعَلَّهُم يَرجِعونَ﴾ [آل عمران: ٧٢]

واتا: «گرۆیەک لە خاوەنی کتێب گوتیان: سەرەتای ڕۆژ باوەڕبێنن بەوەی کە دابەزیوەتە سەر ئەو باوەڕدارانە[موسڵمانان]، لە کۆتایی ڕۆژیشدا بێباوەڕ ببنەوە پێی، بەشکو [ئەوانیش بلەقن] بگەڕێنەوە.»

هەرچۆنێکیش بێت، دوو لەسەر سێی سووپا هێشتا لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) مانەوە، لەناویشیاندا «عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر» و «خەووات»ی برای.

وەکوو «عەبدوڵڵا» پێغەمبەر (ﷺ) دەیکاتە ئەمیری تیپێک لە تیرهاوێژە بەتواناکان، کە ژمارەیان دەگەشتە پەنجا جەنگاوەرێک، فەرمانیشیان پێدەکات کە لەسەر کێوێکی بچووک بگیرسێنەوە[1]، کە دەکەوتە سەر ئەو

---

(1) لەدواییدا ناوی لێنرا کێوی تیرهاوێژان، کە بەنزیکەی ١٥٠ مەتر دوور بوو لە مەڵبەندی سووپای ئیسلامی.

تاقە ڕێگەیەی کە موشریکان دەکرا لێیەوە بڕژێنە سەر موسڵمانان، پێشی فەرموون: "ئەو سوارانەمان بە زەبری تیر لێ بگێڕەوە، با لە پشتەوە نەیەنە سەرمان، بارودۆخ بۆ ئێمە بوو یاخود لە دژی ئێمە بوو؛ ئێوە لە جێی خۆتان بمێننەوە و کارتان پێوە نەبێت؛ با لای ئێوەوە نەپێکرێین".

بە تیرهاوێژانیشی فەرموو: "لە پشتەوە بمانپارێزن...ئەگەر بینیتان وا دەشکوژرێین مەیەن بەدەممانەوە...ئەگەر بینیتان دەستکەوت کۆدەکەینەوە هەر بەشداریمان مەکەن...ئەگەر بینیتان پەلەوەر دەمانبات بە ئاسمانیشدا ئێوە کارتان نەبێت و لە جێی خۆتاندا بن هەتا خۆم دەنێرم بە شوێنتاندا. ئەگەر بینیتان دوژمنمان بەزاندووە و شێلاومانن، هەر لە جێی خۆتاندا بن هەتا دەنێرم بەشوێنتاندا!".

ئا بەم جەختلێکردنەوە توندە کارەکە بەڕێوە دەچوو...

تیرهاوێژان گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) بوون و توانیان سێ هێرشی توند تێکبشکێنن کە «خالیدی کوڕی وەلید» پێشڕەوێتی لێ دەکرد - کە ئەو کات هێشتا لە موشریکان بوو- لەلای چەپی موسڵمانانەوە.

لە سەرەتادا بەزین بەشی موشریکان بوو، بەڵام لە دواییدا ئەوە لە دەستی تیرهاوێژان قەوما کە قەوما، کاتێک لە شوێنی خۆیان دابەزین لەپاش ئەوەی سەرکەوتنی موسڵمانانیان بینی و وایانزانی شەڕەکە کۆتاییهاتووە، ئا لێرەدا شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەر ڕوودەدات!

ASTANA

## شایەتیدانەکەی «خەووات»

وەختێک تیرهاوێژان سەرپێچی فەرمانەکەیان کرد و دابەزین... شەیتان بینی کە هەلێکی چاک ڕەخساوە تاوەکوو بە شێوەیەکی بەرجەستە و ئاشکرا دەستوەربدات و لەناو جەنگاوەراندا هاواربکات "ئەهای بەندەکانی خوا... پشتەوەتان!".

واتە: وریای بەشی پشتەوەتان بن، «أُخراكُم» وشەیەکی ناسراوە لەو هەلومەرجەدا بە یەکێک دەوترێت کە ترسی ئەوەی هەبێت لەکاتی جەنگدا لە پشتەوەی بۆی بێن.

لەوێدا موسڵمانان بینیان کۆمەڵانێکی زۆر لە پشتیانەوەن (ئەو تیرهاوێژانەی دابەزین و لە پشت ئەوانیشەوە ئەو موشریکانەی لەلای کێوەکەوە هاتبوون)، لەناو تەپ و تۆزی چڕ و تێکپڕژانی توندا موسڵمانان لەناو خۆیاندا زۆرێکیان لە یەکتر بریندار کرد.

ببوورە...بەس چۆن شەیتان بە شێوەیەکی بەرجەستە دەستوەردانیکرد؟

بەڵێ، شەیتانی نەفرینلێکراو چووبووە شێوەی پیاوێک لە موسڵمانان بەناوی «جوعالی کوڕی سوڕاقە»، کاتێکیش هەندێک لە هاوەڵان ئەوەیان دی کە ڕوویدا، خەریکبوو پەلاماری «جوعال» بدەن لەسەر ئەو هاوارەی کە کردی و بوویە هۆکاری ئەو شلۆقییە، بەڵام کۆمەڵێکیان کە «خەوواتی کوڕی جوبەیر»یش یەکێک بوو لەوان؛ شایەتی ئەوەیان دا کە «جوعال» لەو ساتەدا لەگەڵ ئەواندا بووە، جا زانیان کە ئەو نەفرەتییە چۆتە شێوەی ئەوەوە بۆ ئەوەی خەڵکەکە سەرلێبشێوێنێت، هەروەک بەر لەوەش چۆتە شێوەی جگە لەویشەوە لە غەزای بەدردا و ئەوە یەکەم هاواری نییە!

«جوعال» لە تووڕەیی هاوەڵانی ڕزگاریبوو...لەم پیلانەی شەیتان بۆیان ڕزگاریان بوو. بەڵێ، بەڵام تازە ئیتر سەرپێچی ڕوویداوە و بەزینیش بە هەڵەداوان بەشوێن ئەودا هەر دەبێت بێت.

## دیسانەوە نەفس

شتێک لە حەزی دونیا زاڵبوو بەسەر هەندێک لە نەفسەکاندا... جا هەندێکیان لەناو خۆیاندا گوتیان: «دەسکەوتەکان... دەسکەوتەکان»، هاوەڵەکانتان سەرکەوتن، دەی چاوەڕێی چین»؟!.

لێرەدا کانزای نایابی سەرکردەی پاڵەوان «عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر» بەدەرکەوت کە دەستیکردە بەبیرهێنانەوەیان بە فەرمانەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: "ئەوەتان لە بیرچوو کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموون؟!"

بەڵام دونیا بانگدەکات لەلای خوارەوەی کێوەکەوە. . گوێیان بۆ بانگ و هاواری نەگرت جگە لە چەند هاوەڵێکی کەم. دابەزین بۆ لای دونیا ئاسانتر بوو لە سەختی مانەوە و ئارامگرتن لەسەر کێوەکە، بەمجۆرەش بەشی پشتەوەیان چۆڵ بوو، کەس لەسەر کێوەکە نەمایەوە جگە «عەبدڵای کوڕی جوبەیر»ی ئەمیر و چەند هەندێکی دیکە لەگەڵیدا کە ژمارەیان لە خوار دە کەسەوە بوو، لە جێگای خۆیان مانەوە هەتا ئەوەی کە مۆڵەتیان پێبدرێت، یاخود بە گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بگەنەوە بە دیداری خوای گەورە، لە دواییدا شەهید کران و لە جێگایەکی دیکەدا ژیانیان تەواوکرد، جێگایەک کە لەوێدا نە ترس هەیە نە غەمباری.

لە داخ و کینەی ئەو زەبرە بەهێزانەش کە «عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر» و هاوەڵەکانی وەشاندبوویان لە موشریکان؛ هێندەی کە دەستیان گەشتنێ ئەتکیان بە لاشەکانیان کرد، تەنانەت «عەبدوڵڵا» لە زۆر لێدانی بە نووکەڕم هەموو ئەندامەکانی ناوسکی هاتبوونە دەرەوە.

لە ناوەڕاستی ئەم هەموو تەنگژەیەدا «خەووات» ئێستا لە کوێیە؟

ئەوەتا خۆی بۆت دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "ڕۆژی ئوحود گەشتم بە

لاشەی براکەم، کە کوژرابوو، سکی هەڵدڕابوو، و ناوسکی هەموو هاتبووە دەرەوە، جا بەیارمەتی هاوڕێیەکەم هەڵمانگرت کە موشریکان هێشتا بە چواردەورمانەوە بوون، منیش ئەندامەکانیم خستەوە ناو لاشەی و و بە عەمامەکەم سکیم بەست، و لە نێوان خۆم و برادەرەکەمدا هەڵمانگرت. جا کاتێک ناوسکیم گەڕاندەوە جێگای خۆی دەنگی لێوە هات! برادەرەکەشم تۆقی و لە دەستی فڕێیدا، منیش پێکەنیم!“ واتە: کاتێک بەیارمەتی برادەرێکی بەیەکەوە لاشەی براکەیان هەڵگرتووە لە نێوەڕاستی موشریکاندا، وە ڕیخۆڵەکانی خستۆتەوە ناو سکی و بە عەمامەکەی بەستوویەتی، بۆ ئەوەی لەگەڵ کابرادا هەڵیبگرن، جا کاتێک ڕیخۆڵەکانی گەڕاوتەوە ناو سکی دەنگی هاتووە بەجۆرێک کە هاوڕێکەی ترساوە و بەریداوە، ئەمیش پێکەنیوە!

سبحان الله ئەمە چۆن پیاوێکە؟

چۆن ئەم هەمووە سەیروسەمەرەیەی تێدا کۆبۆتەوە؟

پاکی، و بوێری، و پاڵەوانێتی، و پێشڕەویکردن، و ڕاشکاوی، و ڕۆحسووکی، و بەهێزی و خۆڕاگرییەکی دەروونی کە بەبێ زۆرلەخۆکردن و زێدەڕەوی سەختییەکان تێپەڕێنێت ... زۆر سادە کۆمەڵێک سات و هەڵوێست دەگێڕێتەوە کە زیاتر بە دیمەنە ترسناکەکان دەچن، لەپاش هەموو ئەوەشدا پێدەکەنێت، لەبەر سەرسوڕهێنەری هەموو ئەوەش دەفەرمووێت: ”لە ساتەوەختێکدا پێکەنیوم کە هەرگیز کەس تێیدا پێنەکەنیوە، لە ساتەوەختێکیشدا خەوتووم کە هەرگیز کەس تێیدا نەخەوتووە!“.

گوێی لێبگرە کە ئەو دیاردە «خەوواتییە» تەواودەکات و دەفەرمووێت: ”هەندێکی دیکە ڕۆشتین و چاڵێکم بۆ هەڵکەند... کاتێک سەرقاڵی ناشتنی بووم بینیم سوارێک بە ڕمێک نیشانەی بۆ من گرتۆتەوە و دەیەوێت

بمکوژێت...بەڵام خەوم لێکەوت! بەم جۆرەش لە ساتەوەختێکدا خەوتم کە کەس تێیدا ناخەوێت، کاتێکیش خەبەرم بوویەوە هیچم نەدی. . جا نەمزانی ئەوە چی بوو".[1]

## گڕوبڵێسەی گەڕانەوەکان

ئەم شێوازە گێڕانەوەیەی «خەووات» فریوت نەدات کە بۆ ئەم بەشە دیمەنەی دەکات و تەنیا هەندێکیەتی. . کارەکە زۆر لەوە توند و سەخت و ترسناک و غەماویتر بوو...

وا ئێستا دڵ و ڕوخسارەکان دەگۆڕێن و ڕق و کینە سەردەردێنێت و بڵێسەی ئازارەکان ئەمجاریشیان وەک جاران دێتەوە یاخود زێدەتر.

بەر لە بەدر، پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی چاوپۆشییان لە موشریکان و هاوەڵانی کیتاب دەکرد وەکچۆن پەروەردگار فەرمانی پێکردبوون، و ئارامیان لەسەر ئازاردانەکانیان دەگرت، پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿لَتُبلَوُنَّ فِى أَموالِكُم وَأَنفُسِكُم وَلَتَسمَعُنَّ مِنَ الَّذينَ أوتُوا الكِتابَ مِن قَبلِكُم وَمِنَ الَّذينَ أَشرَكوا أَذًى كَثيرًا﴾ [آل عمران: ١٨٦]

واتە: «لە ماڵ و گیانتاندا تاقیدەکرێنەوە و لە هاوەڵانی کیتابی بەر لە خۆتان [کە بەر لە خۆتان کتێبیان بۆ دابەزیوە] هەروەها لە موشریکانیشەوە ئازاردانێکی زۆر دەبینن.»

پێغەمبەریش (ﷺ) کاری بەو چاوپۆشییە دەکرد هەتا ئەوەندەی خوا فەرمانی لەسەری بوو، تاوەکوو پەروەردگار مۆڵەتیدان لە بارەیانەوە [مۆڵەتی جەنگ و بەرپەرچدانەوە] ... جا کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) غەزای بەدری کرد،

(1) انظر: «إكمال تهذيب الكمال»، لمغلطاي (٤/٢٢٩).

و پەروەردگار سەرانی بێباوەڕی ملهوڕی قوڕەیشی پێ لەناوبرد، «ئیبن ئەبی سەلوول» و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لە موشریکان و بتپەرستان گوتیان: ”ئەم کارە گەشتۆتە هێز و سەرپێی خۆی و ئیدی چارناکرێت، جا پەیمانیاندا بە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئیسلام و موسڵمانبوون.“[1]

لێرەدا لەو قسەیە ڕابمێنە، کە لەپاش هاتنی سەرکەوتن و زاڵی [بۆ موسڵمانان] گوتی: ”ئەمە کارە گەشتۆتە هێز و سەرپێی خۆی و ئیدی چارناکرێت!“ واتە زاڵ و بەردەوامبووە، و تەمای نەمانی ناکرێت، ئەوجا «ئیبن سەلوول» موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند، و کۆمەڵێکی زۆریش لەوانەی کە لە سەرەتادا خاوەخاویاندەکرد و خۆیاندەگرت لەگەڵیدا هاتن و دەستیانهەڵگرت لە و دوژمنایەتیکردنی ئاشکرای پێغەمبەر (ﷺ) و چوونە ناو ڕیزی موسڵمانانەوە.

ئێستا -بەڕای تۆ- لەپاش شکستی ئوحود چی ڕوودەدات؟

ئەوەشی بخەسەر کە زۆرینەی ئەوانەی کە لەگەڵ «ئیبن سەلوول»دا موسڵمانبوون هەر ئەوانە بوون کە پشتیانهەڵکرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و لە ڕێگەدا گەڕانەوە لەپاش ئەوەشی کە هەردوو بەرە [موسڵمانان و موشریکان] گەشتبوون بە یەک...خۆ خۆیان دەزانن کە ئەوان بەشێک بوون لەو شکستە، بەڵام ئێستا هەل ڕەخساوە بۆ دووبارە ئاشکراکردنی دوژمنایەتیکردن و ئازاردان، خۆ ئیتر ئەو هۆکارە نەما کە هێنانیە ناو ئیسلامەوە...ئیدی ئەوڕۆژ ئیسلام لەو هێز و سەرپێییەدا نەمابوو وەک پاش بەدر، سا بۆچی ملی بۆ بدەین کە ئاوا لاواز و برینداربووە؟

-ئەمە قسەوباسی ناو دووڕووان بوو-.

«خەووات» و هاوڕێکانی هێشتا لە گواستنەوەی لاشەی کوژراوەکانیان

---

(1) انظر: صحيح البخاري (٤٥٦٦)، من حديث أسامة بن زيد.

بۆ مەدینە پشوویان نەدابوو، کە یەکێک بانگیکرد ئەرێ موسڵمانان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانیداوە کوژراوەکانی ئوحود بگەڕێنرێنەوە ئەو شوێنانەی کە تێیدا کوژرابوون و کەوتبوون.[1]

فەرمانی پێغەمبەری وا بوو کە شەهیدەکانی ئوحود لەو شوێنانەی کە تێیدا کوژرابوون بەخاکبسپێردرێن، لەپاش ڕۆژێکی درێژ و ماندوویی و هێز لەبەربڕانێکی سەخت و سەرقاڵبوونەوە بە بریندارەکان و ناشتنی کوژراوەکان، و ئەوەندەی کە لاشەیان ئامێزی بە زەویدا کرد بۆ ئارامگرتن و پشوودان، هەواڵ بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەشت کە موشریکان کاتێک ئوحودیان بەجێهێشتووە، و گەشتوونەتە «ڕەوحاء»، پەشیمانبوونەتەوە و دەستیانکردۆتە لۆمەولۆکاری یەکتری و گوتوویانە: "نە موحەممەدتان کوشت، نە کیژۆڵانتان وەبەر خۆ دا، سا دەستتان خۆش نەبێت گوایە چیتانکردووە"؟ هەروەها یەکلابوونەتەوە کە بگەڕێنەوە بۆ ڕیشەکێشکردنی موسڵمانان. پێغەمبەریش (ﷺ) بانگی لە خەڵک کردەوە بۆ دووبارە دەرچوونەوە....

ئا ئێستا و بەم حاڵەوە؟!

بەڵێ، فەرموویشی: «کەسێک نەبێت کە خۆی ئامادەی ئوحود بووە، جگە لەو لەگەڵماندا نەیەت!»، موسڵمانانیش لەبەر فەرمان و بانگی هەستان و لەوپەڕی برین و ئازار و خەفەتباری خۆیانەوە هاتن و گوتیان: [بەسەر چاو و بەسەر سەر] وا بیستمان و گوێڕایەڵ بووین.

ئەو ئایەتانەش لەبارەی خەووات و هاوڕێکانیەوە دابەزی: ﴿الَّذينَ استَجابوا لِلَّهِ وَالرَّسولِ مِن بَعدِ ما أَصابَهُمُ القَرحُ ...﴾ [آل عمران: ١٧٢] واتە: «ئەوانەی کە لەپاش برین و ئازار پێکەوتنیشیانەوە هەستان لەبەر فەرمان

---

(1) ينظر: «السنن الكبرى» (٢١٤٢).

و بانگی خوا و پێغەمبەری خوا و وەڵامیاندایەوە.»

سا جوانترین پڕپاداشتترین وەڵامدانەوە بوو، و قەشەنگترین و پایانترین نازناو و مەدالیای نەخشێنراو بوو هەتا ڕۆژی دوایی.

«ئیبن سەلوول»یش هات و گوتی: لەگەڵتدا بێم؟ فەرمووی: «نەخێر!».

ئەوجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) و موسڵمانانێک کە لەگەڵیدا بوون کەوتنەڕێ هەتاکوو گەشتنە «حەمرائولئەسەد»، لەوێدا «مەعبەدی خوزاعی» هات و موسڵمانبوو وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکرد کە بچێت خۆی بگەیەنێتە «ئەبو سوفیان» و وورەی بڕووخێنێت، ئەویش وایکرد. «ئەبو سوفیان»یش لەولاوە گەشتبووە یەکێک لە موشریکان کە بەرەو مەدینە دەچوو، پێی گوت: دەچیت پەیامێکم بۆ بگەیەنیتە «موحەممەد» و منیش کە هاتیت بۆ مەککە باری وشترەکەت بۆ بگرم لە مێوژی نایاب؟ گوتی: بەڵێ. گوتی: بڕۆ وا بە «موحەممەد» بگەیەنە کە ئێمە قۆڵمان لێ هەڵماڵیوە بۆ ڕیشەکێشکردنی خۆی و کۆمەڵەکەشی. جا وەختێک ئەم قسانەیان پێ گەشت فەرموویان: "پەروەردگارمان بەسە و هەر ئەویش باشترین بریکارە - حسبنا اللّٰه ونعم الوكيل"، پەروەردگاریش ئەو فەمایشتانەی دابەزاند: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ١٧٣ فَٱنقَلَبُواْ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُواْ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ﴾ [آل عمران: ١٧٣ - ١٧٤] واتە: «ئەوانەی کە خەڵک پێیانگوتن: وا خەڵک خۆیان بۆ کۆکردوونەتەوە [و لەناوتاندەبەن] سا لێیان بترسن، ئەوانیش باوەڕیان پێی زیاد و قایمبوو وە گوتیان: پەروەردگارمان بەسە و هەر ئەویش باشترین بریکارە. جا بە بەهرە و بەخشش و پێگە و ڕێزێک لەلای خوداوە گەڕانەوە و تووشی هیچ شەڕ و ئازارێکیش نەبوون، وە ئەوان شوێن ڕەزامەندی خودا کەوتبوون کە خودا خاوەن بەخشش و پایەپێدانێکی مەزنە.»

ئاوەها پەروەردگار منەت دەخاتەسەر هەرکەس کە بیەوێت لە بەندە چاک و سوڵحاوەکانی و تاقییاندەکاتەوە و یارمەتیشیان دەدات ئارامبگرن و چەسپاوبن، ئەوجا دیسانەوەش لە بەخششی باوەڕ و پێگە و پایەی بەرزی لای خۆی بەهرەوەریان دەکات.

بەمەش غەزای حەمرائولئەسەد دەبێتە دووەم غەزا لەپاش ئوحود لە ئەلبوومی بەشداریکردنە جیهادییەکانی «خەووات»دا، و سێیەم لەپاش بەدرەوە کە حوکمی بەشداربووی هەبوو تێیدا وەختێک تووشی پێکان بوو لە ڕێگەدا و گەڕێنرایەوە و پێغەمبەریش (ﷺ) پشکی خۆی لە بەدردا بۆ دانا.

بەهەرحاڵ، ڕۆژەکان تێپەڕبوون و ئەوەی پێشبینیمان دەکرد لە زیادبوونی ئازار و گڕوبڵێسەی تاقیکردنەوە بە شێوەی گەورەتر دەهاتنەپێش و ڕوویاندەدا، چەند پێشهاتی سەخت و ناپاکانە یەخەی موسڵمانانیان گرت، لە وێنەی «ڕووداوی ڕەجیع»، و ئەوەی لەپاش ئەویشەوە هات لە کارەساتی «بیری مەعوونە» و ئەوجا جوولەکەی بەنی نوضەیر چاوقایمییانکرد و هەوڵی تیرۆرکردنی پێغەمبەریاندا (ﷺ).

لەو هەوڵەیاندا کە بوویە هۆکاری غەزای بەنی نوضەیر و ڕاگواستنی دووهەمی جوولەکە و دەربەدەرکردنیان لە مەدینە، لەپاش ڕاگواستنی جوولەکەی بەنی قەینوقاع (٢ک).

لەپاشان وەڵامدانەوەی خێرا لەلایەن پێغەمبەر (ﷺ) و سووپای موسڵمانانەوە زووبەزوو هات کە دەرچوون بەرەو بیابانەکانی نەجد، لەپێناو چەسپاندنی بوونی ئیسلامی و تەمبێکردنی ئەو دەشتەکییانەی کە ئازاری موسڵمانانیاندا لەپاش ئوحود، و دەستدرێژیانکردە سەر شاند و نێردەکانی بانگخوازی ڕێگەی خودا، و بوونە هۆکاری ڕووداوە دڵتەزێنەکانی «بیری مەعوونە» و «ڕەجیع»، بەڵکوو دەنگوباسی ئەوە هەبوو کە خۆیان

کۆدەکەنەوە بۆ موسڵمانان، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستپێشخەریکرد لە دەرچوون بۆیان، ئەوانیش تۆقین و هەڵاتن و لە لووتکەی شاخەکاندا خۆیان حەشاردا و جەنگ ڕووینەدا، و موسڵمانان بە سەلامەتی گەڕانەوە، ئەوەی کە بە غەزای ذاتو ریقاعی یەکەم بەناوبانگە.

ئێستاش وا چەند مانگێکی کەم ماوە بۆ ئەو وادەیەی کە موسڵمانان و موشریکان دایاننابوو بۆ دووبارە ڕووبەڕووبوونەوە.[1]

## جەنگێکی زیادیش

ئەم وادەبەستنە لە کۆتایی ڕۆژی ئوحوددا بوو، کاتێک وا بڵاوکرایەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) کوژراوە، ئیدی «ئەبو سوفیان» هاواریدەکرد و بانگی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و «ئەبو بەکر» و «عومەر» دەکرد، پێغەمبەریش (ﷺ) دەیفەرموو وەڵامی مەدەنەوە، هەتا ئەوەی کە «ئەبو سوفیان» خۆی هەڵنا و فشبوویەوە و گوتی: بەرزبەوە هۆ هوبەل! ئەوجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردن وەڵامیبدەنەوە ئەوانیش گوتیان: "اللّٰه بەرز و مەزنترە"، ئیدی وتووێژێک لە نێوانیاندا بەڕێوەچوو هەتا ئەوەی کە «ئەبو سوفیان» گوتی: وادەتان بەدرە بۆ ساڵی داهاتوو!

گوتیان: بەڵێ؛ ئەوە لە نێوان ئێمە و تۆدا «وادەیە!».

پێغەمبەر (ﷺ) بە هاوەڵێتی «خەووات» و هاوەڵانی دیکەی سووپا دەرچوون بۆ هێنانەجێی ئەو وادەیەی کە لەسەری ڕێککەوتبوون، هەتاکوو گەشتنە بەدر و لەوێ نیشتەجێبوو بۆ چاوەڕوانیکردنی موشریکان، «ئەبو

---

(1) بۆ خوێندنەوەی زیاتر سەبارەت بە جەنگی نەجد و تەمبێکردنی دەشتەکییەکان، بڕوانە ئەڵقەی «جابر لە سایەوسێبەری پەروەردەی پێغەمبەریدا»، بەشێکە لەم زنجیرەیە، غەزای ذاتو ریقاعی یەکەم.

سوفیانی کوڕی حەرب»یش لەناو دوو هەزار موشریکی مەککەدا دەرچوو، کە پەنجا ئەسپیشیان پێبوو، لەپاشان پەڵپی ئەوەی هێنایەوە کە ساڵ وشکەساڵییە و لە ڕێگەدا گەڕایەوە.

لە «بەدری وادە»شدا موسڵمانان هەشت ڕۆژ مانەوە و چاوەڕێی موشریکانیانکرد، هەرچیش کەلوپەلی بازرگانی لەگەڵ خۆیاندا هەڵیانگرتبوو فرۆشتیان، و درهەمێک بە دووان قازانجیانکرد، و لەپاشان گەڕانەوە بۆ مەدینە.

بەر لە گەڕانەوە، و لە میانەی ڕۆژانی چاوەڕوانیدا، هەندێک ڕووداو بۆ «خەووات» ڕوویاندا کە شایانی تێڕامان و لێ فێربوونن.



## جەنگەکەی خەووات:

با گوێی لێبگرین کە خۆی لەبارەی خۆیەوە بۆمان بگێڕێتەوە، دەفەرمووێت:

"لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لە «مورڕو ظەهڕان» لاماندا و گیرساینەوە. جا من کە لە چادرەکەم دەرچووم بینیم چەند ئافرەتێک دانیشتوون و قسە دەکەن، منیش دڵم چوو بەلایاندا، گەڕامەوە و کەلوپەلەکانم دەرهێنا و بەرگێکی جوانم لەبەرکرد و هاتم لەگەڵیاندا دانیشتم، جا پێغەمبەریش (ﷺ) لە گومەزییەکەی دەرچوو، فەرمووی: 'باوکی عەبدوڵڵا ئەوە چی دایینیشاندوویت لەگەڵ ئەوانەدا؟'. وەختێک پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی سامم لێ نیشت و تێکەڵمکرد، گوتم: 'ئەی پێغەمبەری خوا وشترێکم بەرەڵڵا بووە، بەدوای جڵەوێکدا دەگەڕێم بۆی!'

جا کەوتەڕێ و منیش شوێنیکەوتم، عەباکەی دایە دەستم و چووە ناو

دار ئەراکەکانەوە -هەر دەڵێی ئێستایە تەماشای سپیایی ناوشانی دەکەم لەناو سەوزایی ئەراکەکاندا- کاری خۆی تەواوکرد و دەستنوێژیگرت، که هات ئاو له ڕیشییەوە بەسەر سنگیدا دەچۆڕا - ئەوجا فەرمووی: 'باوکی عەبدوڵڵا بەرەڵڵابوونی وشترەکەت بەکوێ گەشت؟'. پاشان کەوتینه سەر ڕێی گەڕانەوە، ئیدی له هەرکوێدا پێمدەگەشت دەیفەرموو: 'السلام علیک، ئەرێ باوکی عەبدوڵڵا بەرەڵڵابوونی ئەو وشتره بەکوێ گەشت؟'.

وەختێک ئەمەم بینی پەلەمکرد زوو بگەمه مەدینه، له مزگەوت و هاونشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دووركەوتمەوە، که ئەو بارودۆخه درێژەیکێشا کاتێکی چۆڵبوونی مزگەوتم هەڵبژارد، و چووم، دەستمکرد به نوێژکردن، پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەناکاو له یەکێک له گۆشەکانی [ماڵەکانی خێزانەکانی] دەرچوو زووبەزوو دوو ڕکاتی کورتی کرد، منیش درێژمکردەوە بەتەمای ئەوەوە که بڕوات و دەستم لەسەر هەڵگرێت، ئەویش فەرمووی: «باوکی عەبدوڵڵا چەندت دەوێت درێژیبکەوە، هەڵناستم هەتا لێدەبیتەوە!».

جا له دڵی خۆمدا گوتم: سوێند به خوا داوای لێبوردن له پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەم و دڵی دێنمەوە، جا کاتێک فەرمووی: «السلام علیک باوکی عەبدوڵڵا، ئەرێ بەرەڵڵابوونی ئەو وشتره بوو به چی؟» گوتم: سوێند بەوەی به حەق تۆی ناردووە، ئەو وشتره لەوەتەی موسڵمانبووە بەرەڵڵا و هار نەبووە، جا فەرمووی: «ڕەحمەتی خوات لێبێت» سێ جار، ئیدی لەوەودوا هیچی لەو بابەتەی پێ نەگوتمەوە."(١)

وەختێک ئەم دەقه قەشەنگه دەخوێنیتەوە تەنیا سەرسوڕمانت بۆ دەمێنێتەوە له دڵی ئەم پیاوە که ئەو بوێرییە بەهێزە و ئەو نەرمییە نایابەشی تێدا کۆبۆتەوە، لەپاشان ئەو خۆشویستنه ڕاستاڵانەیە دەرهەق

---

(1)أخرجه الطبراني في «الكبير» (٤/٢٠٣، ٢٠٤) (٤١٤٦).

ASTANA

بە موسڵمانان کە وای لێکردووە هەموو ئەو چیرۆکە بگێڕێتەوە و خۆی ڕاوی ڕووداوەکە بێت و خۆی بخاتە شوێنی گومان، و لە هەمانکاتیشدا بکەوێتەبەر لۆمەی هەندێکەوە سەبارەت بەو کارە!

«خەووات» چیرۆکەکەی بە چەسپاندنی ئەوە دەستپێدەکات کە لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) ئامادەی ئەو شوێنە بووە «مورِّو ظەهرِان» کە دۆڵێکی گەورەیە لەنزیک مەککە، دەشوترێت بۆیە وا ناونراوە چونکە ئاوێکی تێدایە تاڵە [مُرّ-مورِّ واتە تاڵ].

ئەوجا زۆر خێرا دەخشێت بەرەو ئەو مەبەستەی کە لە پێناویدا ئەم چیرۆکە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "جا من کە لە چادرەکەم دەرچووم بینیم چەند ئافرەتێک دانیشتوون و قسەدەکەن، منیش دڵم چوو بەلایاندا!" وەک بڵێیت لەم ڕستەیەدا ناوەڕۆکانە ئاماژە بەو سرووشت و پێکهاتە و ناوەندی تاقیکردنەوەیەی خۆی دەکات کە هەر لە ڕۆژی هاتنە ناو ئیسلامیەوە هەوڵی جڵەوگیرکردنی دەدات، جا کاتێک لە چادرەکەی دێتەدەرەوە، ئەوەش چونکە ئەوان لە ناوچەکەدا نیشتەجێبوون و چادرگەیان دامەزراندووە، کە چادر[چادری موویین-خێمە] لە شێوە ماڵەکانی عەرەبە، خێرا دەیخەنەسەرپێ لە شێوەی خێمەدایە، بەڵام هەندێک بچووکترە لەسەر دوو یان سێ کۆڵەکە دەوەستێت.

«بینیم چەند ئافرەتێک قسەدەکەن»، بوونی ئافرەتان لێرەدا نامۆ نییە، چونکە لەم شوێنەدا بازاڕێک سازێنراوە، دەکرێت وێنە دێرینەکەی بازاڕ بووبێت کە ئەو وەخت لەسەر ڕێگە خێراکان و ڕێگەکانی گەشت دادەمەزرێنرا بۆ بەڕێخستنی پێداویستی گەشتیاران، یاخود کڕینەوەی کەلوپەل و بارەکانیان کە هەڵیانگرتووە بۆ ئەوەی ببرێت و دووبارە لە مەککە بفرۆشرێتەوە بە نرخێکی بەرزتر، ئەوەشی کە پەرتووکەکانی سیرە تۆماریانکردووە کە موسڵمانان بە بازرگانییەوە دەرچوون بەرەو بەدر [بەدری

واده] و قازانجێکی زۆریان کرد؛ جەخت لە هەمان خاڵ دەکاتەوە.[1]

ئێستا لێرەدا سێکوچکەیەکی ترسناکمان هەیە: ئافرەت، بازاڕ، و ئارەزوویەکی گڕگرتوو!

ئافرەتەکان: بەڕەهایی تاقیکردنەوە هەرە سەخت و بەزەرەرەکەن بۆ پیاوان لەم دونیایەدا، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) خۆی دەفەرمووێت: «ما تركتُ بعدي في النَّاسِ فتنةً أضرَّ على الرجالِ منَ النِّساءِ»[2] واتە: «لەپاش خۆم لەناو خەڵکدا هیچ ئاشووبێکم بەجێنەهێشتووە بەزیانتر بێت بۆ پیاوان لە ئافرەتان»، بەتایبەت ئەگەر پابەند نەبن بە ڕێکارەکانی خۆداپۆشین و شەرم و شکۆوە، ئیدی لەوە گەڕێ کە ئەسڵەن موشریکیش بن، وەک لێرە لە چیرۆکەکەی «خەووات» دا دیارە.

بازاڕیش: شوێنە خۆشەویست و دڵخوازەکەی شەیتانە، چونکە بوار و مایەی گشت گزی و فێڵ و سووخۆری و سوێندخۆرییەکی ناڕەوا و بەتاڵ و درۆ و پەیمانشکێنی و پشتکردنێکە لە یادی خودا، هەرچیش خراپەی دیکەی هاوشێوە و جۆری ئەمانە هەیە، هەربۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «وأبغض البلاد إلى الله أسواقها»[3] واتە: «ڕقلێبووترین ناوەندەکانی زەویش بەلای خوداوە بازاڕەکانین».

لەم بارەیەوە بەخزمەت تاریف و پۆلێنێکی ناوازە گەشتووم کە لەم گۆشەیەوە لەسەر بازاڕەکان دەدوێت، فەرمایشتێک کە هەر دەڵێی لە چرادانی پێغەمبەرایەتییەوە دەرچووە، لەسەر زمانی هاوەڵی بەئیلهام و پێکان «سەلمانی فارسی» (ڕەزای خوای لێبێت) کە بازاڕەکان ناولێدەنێت: «جەنگی شەیتان!»، وەک فەرموویەتی: «ئەگەر توانیت یەکەم کەس مەبە

---

(1) ينظر: «سبل الهدى» للصالحي (٤/٣٣٨).
(2) انظر: صحيح البخاري (٥٠٩٦)، وصحيح مسلم (٢٧٤١).
(3) انظر: صحيح مسلم (٦٨١).

کە دەچێتە ناو بازاڕەوە، نە کۆتا کەسیش کە لێی دەردەچێت، چونکە ئەوێ گۆڕەپانی جەنگی شەیتانە، و هەر لەوێشدا ئاڵای خۆی دادەکوتێت».[١]

وردبەرەوە کە چۆن فووتێبوون و سنگدەرپەڕاندنی شەیتانی چرووک باس لێوەدەکات لە نێوەڕاستی ئەو کارە ناشرینانەی کە بەخەڵکی دەکات لەوێدا، چۆن وەک تاوانبارێک کە لە زەوی سنوور و ناوچەی خۆی و لەناو شوێنکەوتە و پشتیوانانی خۆیدا ڕاوەستابێت ... چ کەش و فش و هێز و هەژموونێکی هەبێت بۆ خراپەنانەوە؟! هەربۆیە پێشەوا «نەوەوی» ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێت:

"بازاڕ و ئەوەی شەیتان بە ئەهلی بازاڕی دەکات و دەستیان لێ دەوەشێنێت؛ چوواندوویەتی بە «جەنگ» لەبەر زۆری جۆری ئەو بەتاڵیانەی تێیدا دەگوزەرێت وەک گزی و فێڵ، و سوێندی ناپاک، و گرێبەستی بەتاڵ... «هەر لەوێشدا ئاڵاکەی دادەکوتێت» ئاماژەیە بۆ جێگیربوونی لەوێدا، و کۆبوونەوەی هاوکارانی لەگەڵیدا بۆ دووبەرەکینانەوە لەناو خەڵکیدا و، دووچارکردنیان بەم خراپانەی کە باسکران، و هاوشێوەیان، ئیدی ئەوێ جێگای خۆی و یارانیەتی".[٢]

کوچکەی سێیەم ماوەتەوە کە ئارەزووی گڕگرتووە کە پێشتر لە سەرەتادا باسمانلێکرد، کە لێرەشدا لە «خەووات» دا بوونی هەیە، باسمانکرد کە چۆن لە نەفامیدا نموونەی پێ دەهێنرایەوە لە بەهێزی حەز و ئارەزوویدا[٣] کە تەنیا «خەووات»یش ناگرێتەوە، بەڵکوو هەر پیاوێکی تەندروست بە خۆڕسکی بنچینەیی و جێگیری خۆی حەزی هەیە، بەتایبەت وەختێک کە

---

(1) انظر: «صحيح مسلم» (٢٤٥١).

(2) انظر: «شرح النووي على صحيح مسلم» (٧/١٦).

(3) لە پەرتووکەکانی پەندی عەرەبیدا ئەوە دەبینیتەوە: «أغلم من خوات - حەزوورووژاوتر لە خەووات»، «أنكح من خوات - سەر بە سەرجێیتر لە خەووات»!

حەزلێکراوەکانیش لەبەرچاویدا ڕازێنراوە و ئامادە کرابن.

بەهەرحاڵ، ئێستا کە موسڵمانان چاوەڕێی هاتنی موشریکانن بەمەبەستی جەنگ...جەنگێکی دیکەش هەیە کە لەسەر هەمان خاکدا بەڕێوەدەچێت.

بەڵێ؛ «خەووات» لە هەلومەرجی دەرچووندایە لە چادرەکەی، بێئاگا لە هەر جەنگێکی دیکە جگە لەوەی کە دژ بە موشریکانی قوڕەیش چاوەڕێی دەکات، ناشزانێت چی لە دەرەوە بەدیار ئەمەوە وەستاوە...هەر لە سەرەتای بزووتنیەوە...بەڵکوو لە گشت سەرەتایەکدا!

ئەمە سرووشتی شەیتانە. . گرنگییەکی زۆر بە سەرەتاکان دەدات، چونکە لە سەرەتای هەر کارێکدا ئاڕاستە و سرووشتی ئەو کارە یەکلادەبێتەوە کە چییە و بەرەو کوێیە، شەیتان بە تێکدانی کارەکان لە سەرەتاوە ناوەڕاستەکەشیان خراپبکات، و هەروەها هەوڵدەدات سەرەنجامەکەشیان تێکبدات.

هەربۆیە لە ئیسلامدا هاندانێکی زۆر توند هاتووە بۆ گرنگیدان بە سەرەتاکان و پاسەوانیکردنیان بەجۆرێک کە پیلانی شەیتان تێکبدات. .

پارێزبەندی لە بەیانیان و ئێواراندا، و لە کاتی دەرچوون لە ماڵدا و کاتی چوونەوە ناو ماڵ، و وەختی سەرەتای خواردن و وەختی لێبوونەوەشی، و چوونە ئاودەست و دەرچوونیش لێی، و بگرە لە هاوسەرگیریدا. . تەنانەت لە کاتی سەرجێییشدا، لە سەرجەم سەرەتاکاندا دەبینیت شەرعی مەزن پارێزبەندییەکانت بەیاددێنێتەوە بۆ ڕێگریکردن لە پیلانە شەیتانییەکانی تێکدەری ژیانت.

لێرە لە نزیک بازاڕەکان لە بەدردا، شەیتان لە خاکە خۆشەویستەکەی خۆیدایە و داروودەستەکەشی لەژێر فەرمانی ئەودان، هەروەها ئافرەتە

ڕازێنراوەکانیش[1] لە پێش چاوی خەڵکدا ئامادەن تاوەکوو بچنە ناو جەنگەکەوە لەڕیزی ئەودا، هەموو ئەوانە چاوەڕێی دەرچوونی «خەووات» دەکەن، هەموو ئەوانە لە دژی دەجەنگن.

"بینیم ئافرەتانێک قسەدەکەن و دڵم چوو بەلایاندا" بەو هەموو خێراییەی کە لە( و) دا هەیە «ئافرەتانێکم بینی کە قسەدەکەن و دڵم چوو بەلایاندا».

چووە دەرەوە و ئافرەتانێکی بینی و سەرسامیان کرد، ئاوا بە تیری ڕووانینی حەرام پێکرا لە ساتێکی بێئاگاییدا لەو ئامانجەی کە چاوەڕێی دەکرد لە دەرەوەدا.

لە چادرەکەی دەرچوو و شەیتان کەوانی لێ توندکردبوو وە لەنێوان سەربازەکانیدا ئامادەبووبوو هەرکە «خەووات» -بەبێ هۆشیاری- چاوی بەرزکردەوە تیرێکی ژەهراوی پێکای. .

لەژێر کاریگەری ژەهرەکەشدا «خەووات» گەڕایەوە چادرەکەی بۆ ئەوەی جلوبەرگە جوانەکانی لەناو کەلوپەلەکانیدا دەربهێنێت و گوتی: «جلەکانم لەبەرکرد و چووم دانیشتم لەگەڵیاندا». ئاوا بەو شێوەیە!

کاریگەری ژەهر چەند خێرایە وەختێک هۆشیاری نییە و جێگای گونجاوی هەیە!

پێش ئەوەی لەمە بینەوە لێرەدا پرسیارێکی شڵەژاو هەیە: چۆن زانیمان کە وادیارە ئەو ئافرەتانەی لە فەرموودەکەی «خەووات»دا هاتوون

(1) لە فەرموودەدا هاتووە کە ئافرەتان وەختێک لە ماڵ دەردەچن شەیتان دەیانڕازێنێتەوە لە چاوی پیاواندا، واتاکەشی ئەوەیە کە ئافرەت لە دەرچوونیدا شەیتان ئەوپەڕی چاو و ئومێدی لەسەریەتی تاکوو ئەو بە جگە لە خۆی فریوبدات، و جگە لەویش بە ئەو فریوبدات، یاخود هیچ نەبێت یەکێکیان لەو نێوانەدا.

ASTANA

موسڵمان نەبوون؟ ئایا هیچ نیشانەیەکی ڕوون هەیە بۆ ئەوە؟ یاخود کارەکە سادە و ئاسان دەگرین بۆئەوەی تووشی کێشمەکێشمی دیکە نەبین؟

لە وەڵامدا دەڵێین: ئێمە ناتوانین حاڵەتەکە بە درۆ باسکەین لەپێناو ئەوەدا کە وێنەکە جوانبکەین، خۆ ئەگەر ئامانجمان ئەوە بوایە لە بنەڕەتدا ئەو نموونەیەمان هەر باس نەدەکرد لە نموونەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر کە زیاتر باسی ئازایەتی و پاڵەوانێتی دەکات، بەڵکوو پەیمانماندا کە باسی هاوەڵەکە بکەین بەو پێیەی کە مرۆڤە و ئەوە بەسەردا دێت کە بەسەر هەر مرۆڤێکدا دێت.

خودی قورئانیش هەڵوێستی ناخۆشتر باسدەکات لە باسی زاتێکدا کە پلەی لە هاوەڵان بەرزتر بووە و لەوان بەرێزتر بووە و تێبینیشی لەسەر دەدات و وێنەکە جوانناکاتەوە و دەستکاریبکات و بیانووی بۆ بهێنێتەوە. ئایەتەکان لەو باسانەدا زۆرن.[1]

هەرچی بەڵگەی ئەو قسەیەشە کە دەڵێین وادیارە ئەو ئافرەتانە موشریک بوون ئەوەیە کە:

یەکەمیان: چوارچێوەی بەسەرهاتەکە، «خەووات» دەفەرمووێت کە ئافرەتانێکی بینیوە قسەیانکردووە و دڵی چووە بەلایاندا، سادە و ئاسان دەزانرێت کە دڵچوونی بەلایاندا تەنیا لەبەر قسەوباسیان نەبووە، بەڵکوو دیمەنیشیان سەرنجی ڕاکێشاوە کە دانیشتوون لە کاتی ئیشکردن لە بازاڕدا وە لەو فەرمایشتەکەی پێغەمبەریشەوە (ﷺ) دیارە کە ئەوانە خەڵکی ئیش و کار بوونە لە بازاڕ کە پێی دەفەرمووێت: «باوکی عەبدوڵڵا

---

(1) بەنموونە ئایەتەکانی ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰ﴾ یاخود ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ﴾ یاخود ﴿وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ﴾ یاخود ﴿لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ﴾ کە لە باسی پێغەمبەردا (ﷺ) دابەزیون.

ئەوە بۆچی دانیشتوویت لەگەڵیاندا؟» گووتی: لغاوێکم بۆ درووست دەکەن، واتە ئەوان ئیشیان کردووە لە کاروباری سواری و وڵاغی ڕێبواراندا، یاخود دەتوانین ناوی لێ بنێین «ئێکسسوارات» و ئەوەی کە سواری پێویستییەتی لە زین و لغاو و عەلەف و هەروەها کێڵانی شمشێر و ئەو بابەتانە.

دووەم: کتێبەکانی سیرە باسیان لەوە نەکردووە کە پێغەمبەر(ﷺ) ئافرەتی لەگەڵدا چووبێت بۆ ئەو جەنگە، جا بۆیە ئەو ئافرەتانە ئەهلی بازارِن کە لەو شوێنەدا کاردەکەن.

سێیەم: ئەو ئافرەتانە ئەگەر مسوڵمان بوونایە ئەوا پێغەمبەر(ﷺ) سەرزەنشتی دەکردن هەروەک دانیشتنەکەی «خەووات»ی لەگەڵ ئەوان سەرزەنشتکرد،

بەڵام دەبینیت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمایشتی تەنیا ئاڕاستەی «خەووات» کرد کە فەرمووی: "باوکی عەبدوڵڵا ئەوە بۆچی دانیشتوویت لەگەڵیاندا؟"، چۆن بڵێیت دانیشتنی ئەوان لەوێدا بەهانەدار و بێ گرێیە، کە نیشانەی ئەوەیە ئەهلی بازارِن، بەتایبەت کە شوێنەکە نزیکی مەککەیە کە هیچکەس ئێستا موسڵمانێتی خۆی تێدا ڕاناگەیەنێت، کە ئێمە هێشتا لە ساڵی چوارەمی کۆچیداین.

ئاسایی زانراوە «خەووات» هەرچەند بوێریش بێت ناتوانێت بەوشێوەیە لەگەڵ ئافرەتانی مسوڵمان لە سەرەڕێگەدا دابنیشێت هەر لانی کەم لە ترسی ئەو خەڵکەی بەوێدا تێدەپەڕن، یاخود لە ترسی مێردەکانیان. لەوەش زیاتر درێژەی پێنادەین، بابەتەکە ڕوونە و ئەگەر لەبەر پرسیارەکەش نەبوایە ئەو وردەکارییەمان بەجێدەهێشت.

ئێستاش هەوڵبدە کە پەی بە گشت ڕەهەندەکانی دیمەنەکە ببەین:

چادرەکەی «خەووات» لە لایەک بە شێوەیەکی ئاسایی دەبێت چادری

دیکەی لە چواردەوردا هەبێت، بازاڕەکەش لە مەیدانەکەدایە و کۆمەڵە ئافرەتێکیش لەوێ دانیشتوون وەک سرووشتی بازاڕ ئەو کەلوپەلانەی کە پێویستی بازاڕکەرانە دەیفرۆشن، یاخود ئەوەی لێیانداوادەکرێت لە خواردن و دوورینی جلوبەرگ و نموونەی ئەو کارانە ئامادەی دەکەن.

لە نزیکیشەوە گومەزییەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە تێیدا دادەنیشێت، کە لە خێمە دەچێت، بچووک و شێوەبازنەییە. بە درێژایی ڕۆژەکە چەند جار پێغەمبەر(ﷺ) لێی دێتە دەرەوە بۆ پێویستیەکانی یاخود بۆ ئامادەکاری نوێژەکان، یاخود بۆ دانیشتن لەگەڵ هاوەڵانی و جێبەجێ کردنی پێویستییەکانیان، وادەزانم دەتوانین وێنەی «خەووات» بێنینە پێشچاو و هەڵوێستەکەی بێتە خەیاڵمانەوە کە لە گەرمەی دانیشتن دایە، جلێکی جوانی لەبەردایە و گوێ لە قسەی ئافرەتەکان دەگرێت یاخود بەشداره لەگەڵیاندا، بە شوێنەواری تیرە ژەهراویەکە مەست بووە و تەزیوە کە شەیتان پێوەینا لە کاتی هاتنەدەرەوەیدا.

پاشان ساتی حەقیقەت هات... پێغەمبەر (ﷺ) لە چادرەکەی دێتە دەرەوە بۆ پێویستییەکی خۆی، تەماشادەکات «خەووات» لەو حاڵەدا لەگەڵ ئافرەتەکاندا دانیشتووە، پێغەمبەر(ﷺ) دەچێتە پێشەوە و لە بەرانبەر «خەووات»دا ڕادەوەستێت، ڕاستەوخۆ سەیری دەکات و دەفەرموێت: "باوکی عەبدوڵڵا ئەوە بۆچی دانیشتوویت لەگەڵیاندا؟"

ئایا پرسیارێکە لە شێوەی نارِەزاییدا؟ یاخود پێغەمبەر(ﷺ) دەیەوێت کە هۆکاری دانیشتنەکەی لەگەڵیاندا بزانێت بەرلەوەی نکۆڵی لێبکات؟ وا دیارە کە هەموو ئەو هۆکارانە لەپشت ئەو پرسیارە دانایەوە خۆیان شاردۆتەوە... سەیر لەوەدایە کە پێغەمبەر(ﷺ) چۆن لەگەڵ ئەو توڕەییەشیدا بە کاردانەوەیەکی جێگیر و داناییەکی سەرسوڕهێنەرەوە هەڵسوکەوت دەکات سەرەڕای هەموو ئەوەش بە کونیەکەی بانگی

لێدەکات، دەفەرمووێت: «باوکی عەبدوڵڵا» و ئەوجا پرسیاری لێ دەکات.

پێغەمبەر(ﷺ) فێرمان دەکات کە بارودۆخەکە هەر چۆنێک بوو بە شێوەیەک مامەڵە لەگەڵ کەسی هەڵە و گوناهکاردا مەکە کە لە پێگەی بشکێنیت لە کاتێکدا کە ئەو لەوپەڕی وروژانی گوناهـ و هەڵە دایە و هێشتان لەژێر کاریگەریدایە، پێویست دەکات هۆشی بێنیتەوە و لە کەشی تاوانەکە دووریبخەیتەوە و کاریگەریەکەی لەسەر نەهێڵی پاشان چی گونجاو بوو ئەوەی پێی بڵێیت، چونکە ئەگەر بەو شێوەیەت کرد زیاتر قسەکەت وەردەگرێت و تووشی خۆبەگەورەزانین نابێت لە قبوڵکردنیدا و شەیتانیش دوور دەخەیتەوە لە دەست تێوەردان لە بابەتەکەدا، هەروەها ئەو ڕێگەیەی شەیتانیش دەبەستیت کە تاوانکارەکە لە دەلاقەی سەرخستنی خۆی و وەڵامدانەوەی سووکایەتییەکانی تۆوە بێتە وەڵام.

«باوکی عەبدوڵڵا بۆچی لەگەڵیاندا دانیشتوویت؟»...کاریگەری ئەم پرسیارە لەسەر «خەووات» بێنەپێشچاو، لەوکاتەدا کە چاوی ئەبڵەقبووە ڕووەو پێغەمبەر (ﷺ) داخورپاو لەو ساتە سەختەی تێیکەوتووە!

گوێ لە «خەووات» بگرە کە بەخۆی ئەو هەڵوێستە وێنا دەکات و دەفەرمووێت: "کاتێک پێغەمبەرم (ﷺ)، بینی سامم لێ نیشت و تێکەڵمکرد".

قسەتێکەڵکردنیش لە ساتێکی ئاوادا زانراوە لەگەڵ زۆربەماندا ڕوودەدات بە شێوەیەک لە شێوەکان، وەک بڵێی وشەکان چەندێک هەڵدێن لە عەقڵی پیتەکانیش لەبەریەک هەڵدەوەشێنەوە لە زمانیدا و بەتەنیا بەجێیانهێشتووە لەهەمبەر شکۆی پێغەمبەریدا. . دەبینیت مرۆڤ هەوڵدەدات پیتەکان کۆبکاتەوە وەک بڵێی تازە بە تازە فێری قسەکردن دەبێت، پیتەکان تەتەڵە دەکەن و وشەکان لە دەرچووندا بزردەبن وەک بڵێی لەوسەری دونیاوە هاتبن!

سۆز و بەزەیی پێغەمبەر(ﷺ) سەرنجی ڕاکێشام لەم دیمەنەدا! ئەو لە ساتێکی خێرادا دێت بۆ فریاکەوتنی «خەووات»، پێغەمبەر(ﷺ) دێتەناو جەنگەکە و پشتی «خەووات» دەگرێت و پاڵپشتی دەکات تاکوو لە بێئاگایی نشینگەی شەیتانی دەرچێت و لە چاڵی مینرێژکراوی بازاڕ بەرزیدەکاتەوە، ئیدی شوێنەواری ژەهرەکەش بژاکێتەوە و شوێن برینی تیرەکە سارێژبێت، و پێکراو بەرەبەرە ئاگایی بێتەوە کە لەم قسەتێکەڵکردن و داخورپانەدا خۆی دەبینێتەوە، کە یەک لە شێوەکانی ئەوەیە کە مرۆڤ بە وشە عەمبارکراوە دێرینەکانی پێشووتری زەینی بدوێت، هەر ئەمەش ڕوویدا!

«خەووات» لە یادگەیدا گەڕا هیچ قسەیەک بە فریای نەگەشت جگە لە وەڵامێکی کۆنی هەڵگیراوی سەردەمی نەفامی، جا گوتی: "سامم لێ نیشت و تێکەڵمکرد و گوتم: 'ئەی پێغەمبەری خوا وشترێکم بەرەڵڵابووە، جڵەوێکم دەوێت بۆی، ئیدی ڕۆشت". پێغەمبەر (ﷺ) ئەم وەڵامە شپرزەیەی بیست و بەجێیهێشت!

بەڵێ، ئاوا «تێپەڕی» بەبێ قسەکردن لەسەر ئەم پاساوە پینەکراوە، وەک بڵێی پێغەمبەر (ﷺ) فێرماندەکات کە پەروەردەکاری لێزان دەستەویەخەنابێتەوە لەگەڵ پاساو و پاکانە لاواز و پینەکراوەکاندا لە ساتی بیستنیاندا، بەڵکوو فەرامۆشیدەکات هەتا کاتی خۆی دەگات.

پشتی تێدەکات هەرچەندە کەلێنەکەش بە ڕوونی دیارە و لە هەڵەکەش دڵنیایە، بەڵام گفتوگۆی دەمودەست دەبێتە هۆی شکانێکی قووڵ لە دەروونی هەڵەکاردا لە هەمبەر پەروەردەکارەکەیدا، بەڵکوو لە هەمبەر خۆشیدا.

ئەو لێرەدا تێدەپەڕێت و پشتهەڵدەکات بە جۆرێک کە هەڵەکار هەست بکات کە پاساوەکانی هیچیان وەرنەگیراون و لەناو خۆیاندا هەڵوەدا و هەڵوەشاوەن ... بەڵام گفتوگۆ دوادەخات تاوەکوو هەلێکی پێبدات بۆ

کۆکردنەوەی دەروونی خۆی تەواوکاری ماوەی بەهۆشهاتنەوەکە، ئەمەش یارمەتیدەدات و هانیدەدات بۆ بیرکردنەوە و لەپاشانیش گەڕانەوە و تەوبەکردن و دووچارنەبوون بە لووتبەرزی و ڕقەبەرایەتی و تۆڵەکردنەوەی کەسی و خۆبەڕاستدانان.

«خەووات» دەفەرمووێت: ڕۆشت و منیش شوێنیکەوتم، عەباکەی بۆ هەڵدام و چووە پشت دارئەراکەکانەوە، وەک بڵێی ئێستایە کە تەماشای سپیایی ناوشانیم دەکرد لەپشت سەوزی ئەراکەکانەوە، کاری خۆی تەواوکرد و دەستنوێژی هەڵگرت، و هات کە ئاو لە ڕیشیەوە بەسەر سنگیدا دەچۆڕا - یاخود گوتی: لە ڕیشیەوە بەسەر سنگیدا دەتکا-(١) ئەوجا فەرمووی: "ئەرێ باوکی عەبدوڵڵا بەڕەڵڵابوونی وشترەکەت بە چی گەشت؟"

پاشان بەڕێکەووتین ئیدی لە ڕێگەدا هەرکات چاوی پێم کەوتبا دەیفەرموو: "السلام علیک، باوکی عەبدوڵڵا بەڕەڵڵابوونی ئەو وشترە بوو بە چی؟"

ئەمە دیمەنێکە لە دیمەنەکانی بەئاگاهاتنەوە...کەسی پێکراو دەستی بە جووڵە کردووە و دێت و دەڕوات بەبێ کێشە بەرە بەرە لە ڕووی دەرەکییەوە چاک بۆتەوە لە کاریگەری ژەهرەکە، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە گووتی «ڕۆشت و منیش شوێنیکەوتم» بەبێ ئەوەی پێغەمبەر ئاماژەی پێبکات کە شوێنیبکەوێت یاخود فەرمانی پێ بکات لەگەڵی بچێت کە ئەمە مانای ئەوەیە کە دەزگاکانی بەباشی کاردەکەن و لە پێغەمبەر (ﷺ) تێگەشتووە بەبێ ئەوەی قسەش بفەرموێت.

---

(١) لە جوانێتی ئەم بەشککەوتنە لە دەربڕیندا ئەوەیە کە ئاماژەیە بە تۆکمەکاری لە گێڕانەوەدا، کە چۆن سەرەڕای درێژی ڕووداوەکەش: وشەکان وەک خۆیان دەگێڕێتەوە، وەختێکیش لە وشەیەک بەشکدەکەوێت، ڕاشکاوانە دەیڵێت.

«خەووات» ئێستا چاوەڕێی هەر پەرچەکردارێکە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) لەبارەی ئەوەوە کە ڕوویداوە. ئەو پشتتێکردنە زۆر مایەی دڵەڕاوکێیە، چیم لەگەڵ دەکات؟ ئایا ڕەقیم بەرانبەر دەنوێنێت؟ یاخود بە تەواوی بێدەنگدەبێت؟ ئایا ئیتر دەنگم لێ وەردەگرێت؟

«خەووات» دەڵێت: «عەباکەی دایەدەست من و. . (ئەمە یەکەم پەیامیی ئارامکردنەوەیە بۆ «خەوات»، وایدەبینم کە ئەو پەیامەی وەرگرتبێت و لە دڵی خۆیدا وتبێتی: کێشە نییە، هێشتا پەیوەندییەک هەیە ئەگەرچی بێدەنگانەشە، بەڵام هەرچۆنێک بێت هێشتا لە بازنەی گرنگیپێدانیدام)

«چووە پشت دارئەراکەکانەوە» عەباکەی دایەدەست من، واتە ئەو پارچە پۆشاکەی کە بەشی سەرەوەی جەستە دادەپۆشێت، چووە پشت دارئەراکەکانەوە[1] بۆ کاری خۆی، ئەراکیش لەو جۆرە درەختانەیە کە لق و پۆپ و گەڵای زۆر چڕ و پڕە، و هەردەم سەوزە، بۆیە «خەووات» دەفەرمووێت: «چووە پشت دارئەراکەکانەوە، وەک بڵێیت ئێستایە کە سپیایی ناوشانی دەبینم لەناو سەوزایی ئەراکەکاندا».

لێرەشدا دەکرێت پرسیارێک لە مێشکی هەندێکدا درووستببێت: ئەگەر «خەووات» دەزانێت کە ئەو بۆ دەست بە ئاو گەیاندن چووە بۆچی تەماشایدەکات؟

وەڵامەکەشی لەناو لێکدانەوەکانی زانایان و پەرتووکەکانی سوننەتدا بڵاو و بەرچاوە، لەبەر زۆری ئەو هەڵوێستانەی کە لە نێوان پێغەمبەر (ﷺ) و هاوڵاندا هەیە لە ماڵ و لە گەشتدا، زێدەڕەویش نابێت گەر بڵێین:

---

(1) موڕڕو ظەهڕان لە ناوچە ناسراوەکانە بە زۆری و بەربڵاوێتی داری ئەراک تێیدا، کە ئەو دارەیە سیواکی لێ دەردەهێنرێت.

کە فەرموودەکانی پاکوخاوێنی [تاراتگرتن] و دەستنوێژ هێندەی ئەدەب و ئاراستەکردن تێدایە کە ئەگەر مرۆڤ لێی ڕابمێنێت سەریسوڕدەمێنت.

پوختەی ئەوەش ئەوەیە کە هاوەڵان سووربوون لەسەر شوێنکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) و شوێنپێهەڵگرتنی لە هەر دەمێکی دەست بە ئاو گەیاندندا، بەڵکوو پێغەمبەر (ﷺ) خۆی نزیکیدەخستنەوە و فێریدەکردن و حاڵەتەکانی بۆ ڕووندەکردنەوە تاکوو لێوەی فێربن و بیشیگێڕنەوە، تەنانەت موشریکانیش ئەوەیان تێبینیکردووە و سەیریانلێیهاتووە کە گوتوویانە: «پێغەمبەرەکەتان هەموو شتێکی فێرکردوون تەنانەت دەستبەئاوگەیاندنیش!».[1]

شتێکی دیکەش کە پەیوەندی بەم ساتەوەختەی خۆمانەوە هەیە لێرەدا، کە ئەوان لە چاوەڕوانی دوژمندا بوون، و بێترس نین لە تیرۆرکردن لەم حاڵەتەدا، هەربۆیە هەردەم پاسەوانییاندەکرد و چاویان لەسەریبوو، بێگومان خەمی چاوپارێزی و ئەوەشیان هەبووە کە لە شەرمگاکان نەڕوانن، هەربۆیە دەبینیت لێرەدا دەفەرمووێت: «هەر دەڵێی ئێستایە کە سپیایی ناوشانی لەناو سەوزایی ئەراکەکاندا دەبینم»، وادیارە پێغەمبەریش (ﷺ) لەم حاڵەتەدا بەپێوە میزیکردووە، هەربۆیە «خەووات» بۆی گونجاوە لە پشتی بڕوانێت، جا «خەووات» (ڕەزای خوای لێبێت) لێرەدا سەرجەم بەرژەوەندییەکانی ڕەچاو دەکات: بەرژەوەندی پاسەوانیلێکردنی، و بەرژەوەندی خزمەتکردنیشی (ﷺ) و «بیستنی بانگلێکردنی ئەگەر پێویستییەکی هەبوو، یاخود بینینی ئاماژەکردنی ئەگەر ئاماژەیکرد».[2]

«خەووات» دەفەرمووێت: "جا کاری خۆی تەواوکرد و دەستنوێژیگرت، و گەڕایەوە کە ئاو لە ڕیشیەوە بەسەر سینەیدا دەچۆڕا- یاخود گوتی: لە

---

(1) انظر: «صحيح مسلم» (٢٦٢)، لە سەلمانەوە (ڕەزای خوای لێبێت).
(2) انظر: «فتح الباري» (١/٣٢٩).

ڕیشیەوە بەسەر سینەیدا دەتکا-" جا فەرمووی: "ئەرێ باوکی عەبدوڵڵا بەرەڵڵابوونی ئەو وشترە بوو بە چی؟" ئەوجا کەوتینەڕێ ئیدی هەرچەند لە ڕێگەدا پێمدەگەشت دەیفەرموو: "السلام علیک، باوکی عەبدوڵڵا ئەرێ بەرەڵڵابوونی ئەو وشترە بوو بە چی؟"

هیوام وایە تێبینی ئەوەت کردبێت کە پێغەمبەر (ﷺ) هەتاکوو ئەو ساتەش هی فەرمایشتێک لە چەسپاندن یاخود بڕیاردانی نەفەرمووە، هەرچیش تا ئێستا فەرموویەتی لەشێوەی پرسیاردایە. "باوکی عەبدوڵڵا، ئەوە بۆچی دانیشتوویت لەگەڵیاندا؟"، "باوکی عەبدوڵڵا بەرەڵڵابوونی ئەو وشترەکەت بەکوێ گەشت؟".

زۆرجار پرسیارکردن پاراوتر و بەکارترە لە سەرزەنشتکاریدا وەک لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاشکاوانە...بەڵکوو زیاتریش مایەی ڕاکێشانە بەرەو بیرکردنەوە و پێدانی مەیلی گەڕانەوە و تەوبەکردنە، زیاتر لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەوخۆ یاخود ئەوەی بڵێیت تۆ وات کرد و وات کرد.

ئەمە شێوازی پێغەمبەرە (ﷺ) لە زۆرێک لە ڕەوش و هەڵوێستەکاندا، بەڵک شێوازی قورئانی پیرۆزیشە لە چەند حاڵەتێکدا کە دیارترینەکانی ئەوانەن کە بەرانبەر بە خودی پێغەمبەرن (ﷺ) لە جێگاکانی لۆمەکردنی لەلایەن پەروەردگارەوە.[1]

فەرمووی: ئەوجا کەوتینەڕێ ئیدی هەرکات لە ڕێگەدا پێمدەگەشتەوە دەیفەرموو: "السلام علیک باوکی عەبدوڵڵا ئەرێ بەرەڵڵابوونی ئەو وشترە بوو بە چی؟".

پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی هەشت ڕۆژ لە بەدردا مانەوە چاوەڕوانی

(1) وەک لەو فەرمایشتەی پەروەدگاردا: {لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ} [التحريم: ١]، هەروەها: {لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ}[التوبه: ٤٣]

موشریکانیان دەکرد لەپاشان کەوتنەوەڕێ بۆ گەڕانەوە بەرەو مەدینە، وادیارە ئەم ڕووداوەی «خەووات»یش لە کۆتاییەکانی ئەو هەشت ڕۆژەدا بووە، ئیدی پێغەمبەر (ﷺ) لە هەرکوێی ڕێگەدا بە «خەووات» گەشتبا، واتە ڕێگەی مەدینە؛ بیریدەهێنایەوە بە شێوازێک کە تەنیا خۆی و «خەووات» لێیتێدەگەشتن، جا وەک دابی خۆی دەیگوتەوە: "السلام علیک باوکی عەبدوڵڵا بەرەڵڵابوونی ئەو وشترە بەکوێ گەشت؟"، ئیتر ئەم پرسیارە وەک زلە لە ڕوومەتی «خەووات» دەکەوت و هیچکەسی دیکەش جگە لە خۆی حاڵی نەدەبوو، بەمشێوەیە بەدرێژایی ڕێگەکە، چۆن بڵێیت بە «خەووات» بفەرموێت (ﷺ): وانەزانیت هەر بە پرسیارکردنی یەکەمجار و ئەوەی کە عەباکەم دایە دەستت باس بڕاوەتەوە ... نا، کەلێنێک هەیە کە دەبێت پڕبکرێتەوە وەگەرنا گەورەدەبێت و دەقڵیشێتەوە.

«خەووات» ئیدی چوویەناو قۆناغی ئازارخواردنی توندەوە و هەر جارەو یادهێنانەوەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەری قورستردەبوو، نەشیدەزانی چیبکات، و چۆن وەڵامبداتەوە؟

لێرەدا پەروەردەی پێغەمبەری دەدرەوشێتەوە و فرەڕەنگدەبێت لە مامەڵەکردن لەگەڵ هەر مرۆڤێکدا بەپێی حاڵەتی خۆی و ئەوەی بۆی گونجاوە، هەروەها بەپێی سرووشتی هەڵەکە و ئەوەی کە ڕاستیدەکاتەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕاستکردنەوەدا تەنیا یەک قاڵب ناچەقێنێت و هەرچی کەسەکانە لەوێدا بیانئاخنێت، یاخود بە یەک شێواز مامەڵە لەگەڵ سەرجەم هەڵەکاندا بکات، بەڵکوو دەبینیت هەڵەیەک بە ڕێگەی ڕاستەوخۆ ڕاستدەکاتەوە، و لەگەڵ هەڵەیەکی دیکەشدا ڕاشکاوانە ڕووبەڕوودەبێتەوە، دەشکرێت توندی لەگەڵ خاوەنهەڵەیەکدا بەکاربێنێت و بگرە دەنگی لێوەربگرێت و سزاشیبدات، جارێکیش ڕاستکردنەوە وایدەوێت کە زیاتر چاوبخەیتەسەر هەڵەکە و بەشێوازێکی ناڕاستەوخۆ

ڕاستی بکەیتەوە، جارێکیش وایدەوێت زیاتر چاوت لەسەر هەڵەکار بێت و زبری پیشانبدەیت.[١]

لێرەدا لە سێ وێنە ڕابمێنە کە چمکێکت لە فرەڕەنگی مامەڵەی پێغەمبەری لەگەڵ هەڵەکاندا بۆ بخاتەڕوو ... یاخود با بڵێین سێ ئاست:

یەکەم: پەروەردەکار لە نزیکترین ڕێگە و ئاسانترینیەوە مامەڵەدەکات بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکە، و هەوڵ بەو ئاڕاستەیەدا دەدات کە «بانگەوازکراو - ڕۆڵە و منداڵ - پەروەردەکراو» تێبگەیەنێت کە ئەوەی بۆی دەڕوات هەڵەیە و کاریگەری خراپی لەسەر دڵ و ژیانی هەیە، ئەمەش لە مامەڵەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) دەبینیتەوە لەگەڵ ئەو گەنجەی کە هاتبوو مۆڵەتیدەخواست بۆ زیناکردن.

بێنە پێشچاوی خۆت!

دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا، مۆڵەتی زینام بدە.

خەڵکەکە لێیڕاستبوونەوە و تێیانخوڕی و گوتیان: وس وس دەمتداخە!

دەیانویست بێدەنگبێت لەبەر ڕێز و شکۆی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، و نکۆڵیکردن لەوەی کە هاتووە مۆڵەت بۆ کارێکی ئاوا دەخوازێت.

پێغەمبەریش (ﷺ) پێیفەرموو: «نزیکبەوە».

وەرەپێشەوە. . ئەمە یەکەم ناز بەخشینە!

ئەویش لێینزیکبوویەوە، ئەوجا پێیفەرموو (ﷺ): «بۆ دایکت پێتخۆشە؟»

گوتی: نا سوێند بەخوا، خوا بمکاتە قوربانت.

---

(1) ینظر: التربیة النبویة، د.محمد الدویش، (ص٥١٨، ٥١٩).

فەرمووی: «نە خەڵکیش پێیانخۆشە بۆ دایکیان».

فەرمووی:«بۆ کچت پێتخۆشە؟» گوتی: نا بەخوا ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، خوا بمکاتە قوربانت، فەرمووی: «نە خەڵکیش پێیانخۆشە بۆ کچیان».

فەرمووی: «بۆ خوشکت پێتخۆشە؟» گوتی: نا بەخوا، خوا بمکاتە قوربانت. فەرمووی: «نە خەڵکیش بۆ خوشکیان پێیانخۆشە».

فەرمووی: «بۆ پوورت [خوشکی باوک] پێتخۆشە؟» گوتی: نا بەخوا، خوا بمکاتە قوربانت. فەرمووی: «نە خەڵکیش بۆ پووریان پێیانخۆشە».

فەرمووی: «بۆ پوورت [خوشکی دایک] پێتخۆشە؟» گوتی: نا بەخوا، خوا بمکاتە قوربانت. فەرمووی: «نە خەڵۆیش بۆ پووریان پێیانخۆشە».

ئەم دووپاتکردنەوە و لێدانە بەردەوامە لەسەر بەرگی دڵ لەپێناو چاورۆشنبوونەوە و بینینی سەرەنجامەکان؛ ئەوە شایەن و گونجاو بۆ ئەو حاڵەتە.

بەڵێ؛ بەخشینی خۆشەویستی و نازپێدان لە ڕوونترین وێنەیدا، هەروەها بەرچاوڕۆشنکردنەوەش بە سەرەنجامەکان بەهەمان ڕوونی تەواو هیچ پاساوێکی بۆ ناهێڵێتەوە.

لەپاشان هەر بە خۆشەویستیش کۆتاییپێدێنێت و دەستی پیرۆزی دەخاتەسەر سنگی، و دەفەرمووێت:

"خوایە لێیخۆشبە و دڵی خاوێنکەوە، و داوێنی بپارێزە"

پەروەردگاریش وەڵامی پێغەمبەری (ﷺ) دایەوە و بە فەڕوپیتی «دوعا»ی پێغەمبەر (ﷺ) هاتەوەسەرڕێ و باری ڕاستبوویەوە. . بەڵێ، بەڵام بەهەمانشێوە بە فەڕوپیتی «دەعوە»کەشی بەو شێوازە ڕاستەی کە بۆی گونجاوە، ئیدی لەپاش ئەوە، ئەو گەنجە ئاوڕی بەلای هیچێکدا نەدەدایەوە.

ئەمە ئاستی یەکەم بوو.

ئاستی بەرانبەریش؛ تایبەتمەندی ئەوەیە کە بەشێکی زۆر لە ئەرکی دۆزینەوەی ڕاست و هەڵە دەخرێتەوە سەر خودی بانگەوازکراو خۆی وەک لە بانگخواز، جا دەکرێت پەروەردەکار لەڕێگەی کشاندنەوەی ڕوواڵەتەکانی و شاردنەوەیان خۆشەویستی ببەخشێتەوە، هەروەها ڕووانین لە سەرەنجامەکان و هەستکردن بە هەڵە بخاتەوە ئەستۆی هەڵەکار خۆیەوە!

ئەمە بوو کە لە چیرۆکی «کەعبی مالیک» و دوو هاوەڵەکەیدا ڕوویدا وەختێک لە غەزای تەبووک دواکەوتن و لەجێمانەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) کە لە گەشتێک دەگەڕایەوە، بە مزگەوت دەستیپێدەکرد، دوو ڕکات نوێژی تێدا دەکرد، و ئەوجا بەلای خەڵکەوە دادەنیشت، جا کە ئەمە بەڕێوەچوو؛ لەجێماوەکان هاتن، دەستیانکرد بە بەهانەهێنانەوە و سوێند و سوێندکاری، کە هەشتا و چەند پیاوێک بوون، پێغەمبەری خواش (ﷺ) ئەو ڕووکارەی لێوەرگرتن، و پەیمانیپێدان و داوای لێخۆشبوونی بۆ کردن، ئەوجا لەپاشان «کەعب» هات.

ئاگاداربە!

«کەعب» دەفەرمووێت: هاتم بۆلای، وەختێک سەلامم لێکرد بزەیەکی تووڕە ئامێزی کرد، و لەپاشان فەرمووی (ﷺ): «وەرە»!. جا بەپێوە ڕۆشتم هەتا لەبەردەستیدا دانیشتم، پێیفەرمووم: «چی لەجێیهێشتیتەوە، مەگەر تۆ سوارییەکت نەکڕیبوو»؟!

بەم هەموو سووروسافییەوە! میهر و بەرچاوڕۆشنکردنەوەش لە جێگایەکی تایبەتدا ...

«کەعب» دەفەرمووێت: با، سوێند بە خوا من ئەگەر لەلای کەسێکی دیکەی جگە لە تۆ بوومایە لە خەڵکی دونیا، وامدەبینی کە لەژێر باری

تووڕەییەکەی دەربازمدەبێت بە بەهانەیەک ... منیش پیاوێکی بەدەموپلم. . بەڵام سوێند بە پەروەردگار لەوە دڵنیام کە ئەگەر ئەمڕۆ قسەیەکی درۆت بۆ بکەم کە لێم ڕازیبیت پێی؛ نزیکە پەروەردگار هەر لەدواییدا تووڕەتبکاتەوە لێم، بەڵام گەر قسەی ڕاستت بۆ بکەم، کە تووڕەشتبکات لێم، من بەوە ئومێدی لێبوردنی خوام هەر هەیە!

نا سوێند بە خوا، هیچ بەهانەیەکم نەبوو، سوێند بە خوا هیچکات هێندەی ئەو ڕۆژی کە لە تۆ بەجێمام بەهێز و دەوڵەمەندتر نەبووم. ئەویش فەرمووی (ﷺ): "ئیدی ئەم ڕاستی گوت؛ سا هەستە هەتا خودا بۆ خۆی بڕیارت لەبارەوە دەدات".[1]

تێبینی جیاوازی نێوان دوو حاڵەتەکەت دا؟!

لەوێدا پێیدەفەرمووێت: «نزیکبەوە» ... وەرەپێشەوە.

لێرەدا بەم دەفەرمووێت: «وەرە»! لەوێدا سەرەنجامەکانی دێنێتە پێش چاو ئینجا نزای بۆ دەکات. . کارەکەش بە یەک دانیشتندا کۆتاییدێت.

بەڵام لێرەدا ... پێویستی بە پەروەردەیەکە لە جۆرێکی تایبەت، بە کاتێکە کە تێیدا پاک و پاڵفتەبێتەوە، و هەڵەکە ڕاستبکرێتەوە «هەستە هەتا خودا بۆخۆی بڕیارت لەبارەوە دەدات».

ئەوجا ئاستی سێیەم دێت ...

کە ناوەندە لەنێوان دوو حاڵەتەکەدا ... لێرەدا ڕووداوەکەی «خەووات» (ڕەزای خوای لێبێت) ... لەو نێوانەدایە ... نە لە پلەی «کەعبی کوڕی مالیک»دایە (ڕەزای خوای لێبێت)، کە هەر زوو موسڵمانبووە و ئامادەی

---

(1) پەڕاوێک هەیە کە ووردەکاری ژیانی گەورەمان کەعبی کوڕی مالیکی تێدایە لە سایەی پەروەردەی پێغەمبەریدا، بەناونیشانی «قصة حب» ط. دیوان.

عەقەبە بووە و شاعیری زمانپاراوی ئیسلامە، نە وەک ئەو گەنجە نەزانەش وایە.

دەفەرموویت (ﷺ): "باوکی عەبدوڵڵا! بەرەڵڵابوونی وشترەکەت بەکوێ گەشت؟"

"ئەرێ «خەووات»! کاتی نەهاتووە ئەو وشترە لەو هاربوونەی بکشێتەوە"؟!

ئەم نکۆڵیکردنە لە نێوان ئەوە و ئەمەدایە ...

نازپێدان: "ئەرێ باوکی عەبدوڵڵا"!

بەکونیە بانگیدەکات، و دەربڕینێکی نەرمی لەگەڵ بەکاردێنێت.

"بەرەڵڵابوونی وشترەکەت بوو بە چی؟"

دیسان لێرەشدا ناوەندە ... لەنێوان بۆ دایکت، بۆ کچت، بۆ خوشکت، بۆ پوورت پێتخۆشە؟! و لەنێوان ئەو پێداگرییەی فەرمایشتەکەی دیکەیدا: "چی لەجێیهێشتی؟ مەگەر تۆ سوارییەکت نەکڕیبوو"؟!

لێرەدا تێبینیبدە کە بەرچاوڕوونکردنەوە و دەستگرتن لە گشت حاڵەتەکاندا ئامرازەکەی «پرسیارکردن» بوو نەک چەسپاندن، بەمشێوەیە دەبێت بەرچاوڕۆشنکردنەوە بە زیندووکردنەوەی خۆڕسک و دەرهێنانی ئەو باشێتییە بێت کە خودا تێیدا چاندوویەتی؛ بۆئەوەی ویستی گۆڕان خودی بێت و لە دڵەوە هەڵبقوڵێت، و بە ئاوەز و خۆشی خۆی بێت نەوەک تەنیا شوێنکەوتن و تێخزانێکی کەڕوکوێرانەی بێ هۆشیاری.

«خەووات» دەفەرموێت: «جا کاتێک ئەوەم بینی» واتە زۆری سەرزەنشت و بیرهێنانەوەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بە وتنەوەی ئەو ئاماژەیە، «پەلەمکرد زوو بگەمەوە ناو مەدینە، ئەو پەلەکردنەش کاتێک دەبێت

کە نزیکبوونەتەوە لە مەدینە، کە پێغەمبەر (ﷺ) مۆڵەتی هەرکەسێکی دەدا کە بیویستایە پەلەبکات و زووتر بگاتەوە بە خانەوادەکەی و پێبەپێی جووڵەی سووپا نەچێت لەو قۆناغە کۆتاییەی ڕێگەکەدا، جا دەیفەرموو (ﷺ): «هەرکەس پێیخۆشە زووتر بگاتەوە بە خانەوادەکەی؛ با زووتر بگات»[1]، بۆئەوەی وا لە قسەکەی «خەووات» حاڵینەبین کە بەبێ مۆڵەت پەلەیکردووە و پێشکەوتووە و زوو گەڕاوەتەوە.

«خەووات» دەفەرمووێت: «دوورکەوتمەوە لە مزگەوت و دانیشتن بەلای پێغەمبەرەوە (ﷺ)»، بەمشێوەیە، یادهێنانەوە بەردەوامە کە وا خەریکە ئەنجامەکانی دێنەجێ ... هەستکردن بە تاوان سەرەتای تەوبەیە ... وادیارە کە لێدانی بەردەوام ئەو دەروونە بوێرەی والێکردووە شەرم دایبگرێت بەشێوەیەک کە خۆی لە پەروەردەکارەکەی (ﷺ) بشارێتەوە، و بچێتە ناو حاڵەتێکەوە لە گۆشەگیری خودی، لەپێناو بەخۆداچوونەوەدا.[٢]

ببوورە، لێرەدا پرسیارێک هەیە: ئایا مانای دوورکەوتنەوەی لە «مزگەوت و هاونشینی» ئەوەیە کە لە ماڵی خۆیدا دانیشتووە ئیدی نەهاتۆتەدەرەوە؟

وەڵام: نەخێر؛ مەبەست لێرەدا دوورکەوتنەوە لە تەواوی مزگەوتەکان و دابڕان لە نوێژی بەکۆمەڵ نییە، بەڵکوو مەبەستی دیاریکردنی مزگەوتێکی تایبەتە، بەڵام وەک بڵێیت دڵی نایەت کە لە سەرەتاوە بڵێت هاونشینی پێغەمبەرم (ﷺ) نەکردووە بۆیە لەپێشدا گوتی «مزگەوت» و لەپاشان وشە مەبەستەکە دێنێت کە ئەو بڕیاری خۆداشارینەوەی لێ داوە و دەڵێت: «و دانیشتن بەلای پێغەمبەرەوە (ﷺ)»، ماناکەشی ئەوەیە کە لە مزگەوتەکەی

---

(1) انظر: «صحيح البخاري» (٢٨٦١).

(2) شێخی مونەجید دەفەرمووێت: «پەروەردەکاری باش ئەوەیە کە وا لە هەڵەکار دەکات هەست بە شەرمێک بکات کە مایەی خۆداشارینەوە بێت، هەروەها پێویستییەک کە مایەی دووبارە گەڕانەوە و هاتنەوە بۆ بەردەستیشی بێت. لەپاشان دووهەم بەسەر یەکەمدا زاڵدەبێت» بڕوانە: «معالجة الخطأ».

دوورکەوتۆتەوە بۆ خۆونکردن لە خودی ئەو و لەشەرماندا، بەڵام وەک نوێژ لە نوێژگای تیرەکەی خۆیاندا دەیکرد، چونکە چەند مزگەوتی بەربڵاو هەبوون لە هەر گۆشەیەکدا کە موسڵمانان نوێژیان تیدا دەکرد و لەپاشان دەگەڕانەوە سەر کار و ژیانی خۆیان.[1]

لەپاشان فەرمووی: «جا کە ئەوە درێژەیکێشا؛ دەمێکم هەڵبژارد کە مزگەوت ئەووەخت چۆڵبێت، ئیدی هاتم بۆ مزگەوت و دەستمکرد بە نوێژکردن»، واتە کاتێک ئەم دوورییە لە مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) درێژەیکێشا کە دڵخوازترین جێگا بووە بەلایەوە، و وابەستەییەکی توندی پێوەی هەبووە، ئەوەش لەبەر هەبوونی پێغەمبەر (ﷺ)) لەوێدا کە دراوسێی مزگەوت بووە، وە هەستیکرد کە هۆگرییەکەی ئیدی زۆر تینوو بووە و تینی بۆ هاتووە. لە کاتێکی چۆڵی مزگەوتدا هاتووە، لەوە دەچێت لە نێوان نوێژە فەرزەکاندا بووبێت کە خەڵکی بۆی کۆدەبنەوە تاکوو لەوە دڵنیابێت کە پێغەمبەر (ﷺ) نایبینێت ... هات نوێژێکی سوننەت بکات و سینەی لە شنەی نزیکی و هاودەمی جارێکی دیکە هەناسەیەک وەربگرێت، و دڵی لەدەست ئەم ئازاری دووری و دابڕانە تاوێک بحەسێتەوە.

«خەووات» دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە یەکێک لە ماڵەکانی هاتەدەرەوە و دوو ڕکات نوێژی کورتی کرد، منیش نوێژەکەم درێژکردەوە بەو ئومێدەوە کە بچێت و دەستم لەسەر هەڵبگرێت، فەرمووی: "باوکی عەبدوڵڵا چەندی دەتەوێت درێژیبکەوە، هەڵناستم هەتاکوو لێنەبیتەوە."

شەرمکردنی «خەووات» گەشتبووە ترۆپکی خۆی بە جۆرێک کە توانای نەبوو ڕووبەڕووی خۆشەویستەکەی ببێتەوە، بەڵام پێغەمبەری پەروەردەکار

---

(1) پێوەندی خەووات بە مزگەوتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) گەلێک بەهێز بوو تەنانەت ئەو لەگەڵ چەند هاوەڵێکی دیکەدا ناویان لێنرابوو: «ئەهلی مزگەوت» کە لە کۆتایی ئەم پەڕاوەدا ئاماژەپێیدەکرێت.

(ﷺ) دەیویست کە بەرهەمی ئەو خۆداشارینەوەیە تاقی بکاتەوە، ئایا بە مەبەستی تێفکران و تۆبە و گەڕانەوە بووە یاخود جۆرێک بووە لە هەڵاتن و خۆدزینەوە لە باری بەرپرسیارێتی هەڵەکەی و وێنەیەک لە وێنەکانی لاوازی دەروونی؟

لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری بەسۆز و بەزەیی بۆ ئوممەتەکەی، «خەووات» بە نەرمی و ڕووخۆشیەوە تاقیدەکاتەوە، لە بەکارهێنانی ووشەکانیدا میهری لەگەڵ دەنوێنێت بۆ ئەوەی ئەو پەشۆکاویەی کە تووشی ببوو لەئەنجامی داهاتنی ڕووداوە کتوپڕەکەدا؛ نەمێنێت.

جا پێی دەفەرمووێت: "باوکی عەبدوڵڵا چەندی دەتەوێت درێژیبکەوە، هەڵناستم هەتا لێنەبیتەوە". وەک بڵێی ئەوە بوو کە «خەووات»ی هاندا بۆ ڕاشکاوی و ڕاست وتن هەتا ئەوەی کە وتی: "لە دڵی خۆمدا گوتم سوێند بەخوا داوای لێبوردن لە پێغەمبەری خوا دەکەم و دڵی لە خۆم دێنمەوەجێ".

جا کاتێک فەرمووی: "السلام علیک باوکی عەبدوڵڵا، بەڕەڵڵابوونی ئەو وشترە گەشت بە چی؟"

گوتم: "سوێند بەوەی کە بە حەق تۆی ناردووە، ئەو وشترە لەوەتەی موسڵمانبووە بەرەڵڵا و هار نەبووە" پێغەمبەریش (ﷺ) سێ جار فەرمووی: "ڕەحمەتی خوات لێبێت"، لەپاشان ئیدی هیچێکی لەو باسە نەوتەوە.

لەو تێگەشتنە بڕوانە، چۆن وەڵامەکەش هەر لەسەر شەپۆلی پرسیارەکە هات!

«خەووات» دەیزانی پێغەمبەر(ﷺ) تەنیا بە هۆی ئەو دانیشتنەی کە تێیدا بینی هێندە لەسەری توند نەکردووە، بەڵام دەیویست دڵنیا بێتەوە کە ئەوە تەنیا ئاوڕدانەوەیەکی سەرپێیی بووە نەک پەیڕەوێک لە دەستبەردان

و بەئاسانگرتن و چوون بەدەم هەندێک خووی سەردەمی نەفامییەوە.

هەربۆیە «خەووات» بەو شێوەیە وەڵامی دایەوە کە لە تێگەشتنی مەبەستی پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتبوو، بۆی ڕوونکردەوە کە ئەو هەڵەیە تەنیا پێهەڵخلیسکان و سەرپێچییەکی کاتی بوو، کە هەر زوو بیری لێ کردەوە و داوای لێخۆشبوونی کرد و گەڕایەوە، هیچ پەیوەندیەکیشی بەوەوە نییە کە لە ڕابردوودا هەبوو، هەربۆیە وەڵامەکەی پێغەمبەریش گەلێک چەسپاو و میهرەبانانە بوو "خوا ڕەحمت پێ بکات، خوا ڕەحمت پێ بکات، خوا ڕەحمت پێ بکات" خۆشی لە خۆت «خەووات» نزاکەی پێغەمبەر(ﷺ)ت بۆ وەرگیراوە، خۆشی لە خۆت بە گەڕانەوەت بۆ ئەو جێگایەی کە لانکەی خۆتە ... بۆ مزگەوتەکەت.

ئێستاش دەگەڕێینەوە بۆ ئەوەی ڕێگەکە لەگەڵ «خەووات»دا تەواوبکەین، وا لە جەنگی بەدر گەڕاینەوە و چاوەڕوانیش دەبین بزانین لە پاشاندا چی بەسەردێت.

ببوورن، لێرەدا پرسیارێک هەیە بۆ ئەوەی ئەو باسە کۆتایی پێبێنین، لەکوێوە کاتی ئەو ڕووداوەمان زانی، و ئەوەی کە شوێنی ڕووداوەکە «بەدری وادەیە»؟

بەڵێ، لەبەر پرسیارێکی لەم جۆرە بوو کە وامدانا سەرەتا ڕووداوەکان باس بکەم، ڕووانینێکی خێرامان لەبارەی ئەوەوە وەرگرت کە لە خودی بەدری دواییدا ڕوویدا، بەئەرک نەبێت دووبارە دەقی فەرموودەکە بخوێنەوە و پاشان وەرە پێکەوە لەسەر هەندێک خاڵ ڕاوەستین و دواتر بارودۆخە دەروونی و واقیعییەکان بپشکنین کە لەمیانەیانەوە وامان لێکدایەوە کە ڕووداوەکەی «خەووات» کەوتۆتە «بەدری کۆتایی»ەوە.

هەندێک لەوانە:

ASTANA

⊙ ئاماژەکردنی «خەووات» بەو شوێنەی کە لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بۆی دەرچوون، کە «مورڕو ظەهڕان» بوو، ئەوێش هەمان شوێنی غەزاکەیە کە دۆڵێکە لەنزیکی مەککە، پێغەمبەر (ﷺ) پێیدا تێپەڕی بۆ جەنگەکە و هەر لەوێش دابەزی لەسەر ڕێگەیدا بۆ فەتحی مەککە (٨ک) بەڵام ڕووداوەکان پاڵپشتی ئەوە ناکەن کە ئەم باسە لە ڕۆژانی فەتحی مەککەدا بووبێت، لەبەر چوارچێوەی چیرۆکەکە و خێرا گەڕانەوەی «خەووات» بۆ مەدینە، و سەرجەم بڕگەکانی دیکەش کە تێپەڕین.

⊙ هەروەها ئاماژەکردنی بە نیشتەجێبوونیان بەو چادرانەی کە هەڵدرابوون و بوونی گومەزییەکەی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەو غەزایەش (بەدری وادە) هەشت ڕۆژ تێیدا مایەوە چاوەڕوانی موشریکانی دەکرد، کە ئەوەش پێویستی بە هەڵدانی گومەزی و چادرەکان بوو.

⊙ خاڵێکی تریش: ئەوەی کە باسی بوونی «ئافرەتانێک» و بوونی جێگایەکی وەک بازاڕی کرد، حاڵەتەکەش لەم غەزایەدا بەهەمان شێوە بوو، ئەوێ شوێنێکی ئاوەدان بوو کە موسڵمانان ئەو شمەکە بازرگانیانەی پێیان بوو تێیدا فرۆشتیان و بە هەر درهەمێک دوو درهەم قازانجیانکرد.

⊙ هەروەها سرووشتی شوێنەکە «خەووات» ئەوەی باسکرد کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ دەستبەئاوگەیاندن چووەناو دارئەراکەکانەوە، کە لە ناوچەی ئەو غەزایەدا ئەم دارەی زۆر لێیە، هەروەکوو لە فەرموودەی جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە هاتووە کە فەرموویەتی: «لە (مورڕو ظەهران) لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بووین و کەباثمان دەچنییەوە»، کە بەری داری ئەراکە، و پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: «ڕەشەکەی لێکەنەوە بەکەڵک و نایابترە». منیش پێمگوت: "بۆچی تۆ شوانی مەڕ وماڵاتت کردووە؟" فەرمووی: "مەگەر پێغەمبەرێک هەبووە شوانی مەڕوماڵاتی نەکردبێت؟!".[1]

---

(1) أخرجه: البخاري (٣٤٠٦)، ومسلم (٢٠٥٠).

⊙ لێرەدا هێمایەکی نیانیش هەیە لە ئاماژەکردنی دووبارەی پێغەمبەر (ﷺ) بە وشتری بەرەڵڵابوو و هەروەها بە ڕووداوی (ذات النحيين - ئافرەتی خاوەن دوو هیزەکە)، وە لێکچوون لەنێوان ئەو جێگایە کە لە بازاڕ دەچێت و لەنێوان شوێنی ئەو ڕووداوە بە «بازاڕی عوکاز» وەک بڵێی پێغەمبەر (ﷺ) ویستوویەتی پێی بفەرموێت: ئەم شوێنە ئەو ڕووداوەی بیرهێناویتەتەوە؟!

جا کاتێک ویستت وەڵاممبدەیتەوە و دەمت تێکەڵتکرد؛ ئەو وەڵامە عەمبارکراوەی مێشکت پێگوتم کە لە ڕۆژی ئەو ڕووداوەوە هەڵگرتبوو.

بەهەرحاڵ ئەمە تەنیا هەوڵێکە بۆ وێناکردنی وێنەیەکی نزیک لە ژیانی «خەووات» ئەگەر ڕاست بوو ئەوە تەنیا لە خوداوەیە، ئەگەر هەڵەش بێت ئەوە لە من و لە شەیتانەوەیە و خوا و پێغەمبەر لێی بێبەرین.

ئێستاش دەگەڕێینەوە سەر ژیانی ئاسایی خۆمان لە مەدینە ...

ساڵێک بەسەر ڕووداوی بەدری دواییدا تێپەریوە، مەدینەش ئاگری ترس و هەستیاری هەڵیگرتووە سەبارەت بەو هەواڵە ئارامی لێبڕانەوە لەسەر خۆکۆکردنەوە و ئامادەسازبوونێکی زەبەلاح بۆ دان بەسەر مەدینە و موسڵماناندا.

## نێردراوە هێمنەکە

ڕۆژ له دوای ڕۆژ تێدەپەڕێت و دوو ساڵ بەسەر جەنگی ئوحوددا دەڕوات، بارەکەش بەشێوەیەکی ڕێژەیی بەلای مسوڵمانانادا هاتووە بە تایبەت لەپاش ڕاگواستنی جوولەکەی بەنی نوضەیر، و چەسپاندنی شکۆی مسوڵمانان پاش ئەژنۆشکان و دواکەوتنی قورەیش لە ئامادەبووین بەدری دووەمدا، و گەڕانەوەی موسڵمانان بە سەرکەوتوویی لە بەنی موصطەڵەق...بەڵام ئەم سەقامگیرییە زۆر بەردەوام نەبوو، جولەکە چوون کۆتا باڵی خۆیان لە مەدینە کە «بەنی قورەیظە» بوون هاندا بۆ ئەوەی لە وادەی گونجاودا پەیمانبشکێنن، لەپاشانیش ڕوویان لە دووڕووەکان کرد و لە بارەی پێویستی کاری هاوبەش و جووڵەی بەردەوام و خۆمەڵاسدان و بەنیشانگرتنەوەی هەر هەلێک بۆ کەلێن خستنە ناوخۆی کۆمەڵگەوە[1]؛ لە بنگوێیان دەخوێندن، لەکاتێکدا سەرانی جوولەکە و گەورەکانی بەنی نەضیر ڕوویان لە دوژمنە هەمیشەییەکە نا، قورەیش، بۆ ئەوەی بە چەکوچۆڵەی خۆیەوە بێتەوە و شکۆی خۆی بگەڕێنێتەوە، تاکوو لەدواییدا سەرجەم ئەحزاب بە سووپایەکی بێشومارەوە لەدەوری مەدینە کۆبوونەوە، بە نزیکەی دە هەزار جەنگاوەرەوە، بەو واتایەی کە ژمارەی سەربازانی ئامادەکراویان بۆ وێرانکردنی مەدینە بە چەند قات لە سووپای موسڵمانان زیاتربوو.

لەگەڵ خۆئامادەکردنیشدا بۆ هەڵکەندنی کەندێک لە چواردەوی مەدینە بۆ پاراستنی لەم ساتەتە دژوارەدا...هەواڵی ئەوە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و موسڵمان دەگات کە بەنی قورەیظە پەیمانیانشکاندووە!

پێغەمبەریش (ﷺ) چوار لە باشترین سوارچاکەکانی پێکنا بۆ ئەوەی

---

(1) لەو هەلومەرجەدا بوو کە پیلانی هەڵبەستنی بوهتانەکەیان لەسەر عائیشەی ڕاستاڵی پاکداوێنی کچی بوبەکری صدیق خستەڕێ و هەڵایساند، بەڵام ئەوە بوو کە پەروەردگار قورئانی لەبارەی پاکی و بێتاوانی ئەوەوە دابەزاند کە هەتا ڕۆژی دوایی بخوێنرێتەوە.

وەکوو باڵیۆز بیاننێرێت بۆ لای بەنی قورەیظە و لە هەواڵەکە دڵنیاببنەوە، ئیدی «سەعدی کوڕی موعاذ» گەورەی ئەوس و «سەعدی کوڕی عوبادە» گەورەی خەزرەج و لەگەڵیاندا «عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە»ی خەزرەجی و ئیتر ئەم سوارچاکەی خۆشمان «خەوواتی کوڕی جوبەیر»ی ئەوسی ڕەزای خوا لە هەموویان بێت؛ دەرچوون. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "بەڕێبکەون با بزانین ئەوەی کە لەبارەی ئەو خەڵکەوە پێمان گەشتووە ڕاستە یان نا؟ سا ئەگەر وا بوو ئەوا بە ئاماژەیەک پێمبڵێن کە خۆم لێی تێبگەم، نەک وورەی خەڵک بڕووخێنن، ئەگەریش لەسەر پابەندی پەیمانی نێوانمان مابوون ئەوکات بە ئاشکرا بەناو خەڵکدا بیڵێن."

واتا ئەگەر بەڕاستی پەیمانەکەیان شکاندبوو ئەوا وشەیەکم پێبڵێن کە خەڵکی هەستنەکەن، نەوەکا ترس دایانبگرێت، و بەو هۆیەوە وورە و هێزیان بێتەخوارەوە، بەڵام ئەگەر هێشتا لەسەر پەیمان مابوون ئەوا ڕایگەیەنن بۆ ئەوەی خەڵکی بێخەم بن کە پشت و ماڵ و حاڵیان لە ئاسایشدایە.

جا دەرچوون هەتا گەشتنەجێ و بینییان کە دۆخەکە لە خراپترینی ئەوەدایە کە پێیانگەشتووە لەبارەیانەوە، هەروا بێئەدەبیشیان بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد، وە گوتیان: نە پەیمانێک لە نێوان ئێمە و موحەممەددا هەیە نە گرێبەستێکیش!

جا کاتێک جوولەکەکان بێئەدەبییان بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد؛ «سەعدی کوڕی موعاذ» جنێوی پێدان و ئەوانیش جنێویان بەو دایەوە - «سەعد» پیاوێک بوو هەندێک توندی تێدا بوو- «سەعدی کوڕی عوبادە»ش قسەیەکی بۆ کرد کە نزیکە لە زۆر بارودۆخدا ببێتە ڕێسا و بنچینەیەک بۆ کارپێکردن، فەرمووی: «لە شەڕەجنێو لەگەڵ ئەوانە گەڕێ،

ئەوەی لە نێوان ئێمە و ئەواندایە لە شەڕەجنێو گەورەترە».[1]

واتە: ئەوەی ئێستا لە نێوان ئێمە و ئەواندایە لە شکاندنی پەیمان و بێئەدەبیکردنیان بەرانبەر بە پێغەمبەر (ﷺ) گەورەتر و قووڵترە لە شەڕەجنێوێکی ئێستاکی، جا هێندەی لەسەرمانە خۆ سازبدەین بۆ بەرپەرچدانەوە و جووڵەی گونجاو هێندە پێویستمان بەوە نییە.

ئەوجا «سەعد» و «سەعد»، و «ئیبن ڕەواحە» و «خەووات» هاتنە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و سەلامیان لێکرد، و ئەوجا گوتیان: «عەضەل و قارە» واتە: ناپاکییەکیان کردووە وەک ئەوەی کە عەضەل و قارە بە هاوەڵانی ڕەجیعیان کرد؛ «خوبەیب» و هاوڕێکانی.

پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: "اللّٰه أكبر! مژدەتان لێبێ و گەشبین بن ئەی کۆمەڵی موسڵمانان".[2]

بێگومان، لێرەدا و درێژە بەم ڕووداوە نادەین، بەناوبانگیشە لەناو پەرتووکەکانی سیرەدا، بەڵام ئەوەی لای من سەرنجڕاکێشە لێرەدا ئەوەیە کە من چاوەڕوان بووم ئەو شەڕەجنێو و هەڵچوون و توندییە لەلایەن «خەووات»ەوە ڕووبدات (ڕەزای خوای لێبێت)، چونکە ئێمە زۆرجار گیانی پێشڕەوی و ئازایەتی دەبەستینەوە بە سرووشت توندی و دەنگبەرزکردنەوە و خێرا هەڵچوونەوە، کەچی ئەم هەڵوێستە سەرەڕای کورتیشی ئەوەمان فێردەکات کە ئەوانە وابەستەی یەک نین، هەروەها لایەنێکی گرنگیشمان لە کەسایەتی ئەم هاوەڵە پێشڕەوە هێمنە لەسەرخۆیە بۆ دەردەخات، کە لە دواتردا ڕۆڵێکی گرنگی دەبێت لە ڕووداوی پەیوەست بە بەنی قورەیظەوە.

---

(1) انظر: «دلائل النبوة» للبيهقي (٣/٤٣٠)، و«الروض الأنف» للسهيلي (٦/٢٦٩).
(2) ينظر: «السيرة»، لابن هشام، (٢/ ٢٢٢، ٢٢١).

## ئەرکێکی تاکەکەسی

کۆمەڵەکان بەرەبەرە لە دەوری مەدینە خڕدەبوونەوە و دادەچەسپان، جا کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) بە کەوتنەڕێیانی زانی؛ ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد و ڕاستەوخۆ دەستی بە قایمکردنی مەدینە کرد، هاوەڵی جوامێر و کارامەش «سەلمانی فارسی» ڕای ئەوەی دا کە کەندێکی لێبدرێت لە نێوان دوژمن و مەدینەدا، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمانی بەوە کرد، و موسڵمانانیش ڕاست دەستبەکاربوون، و خودی خۆشی (ﷺ) کاری تێدا دەکرد، تاکوو پێش هێرشی بێباوەڕان بکەون بۆ سەریان، و بۆ هەنگاوی دواتر لە ئامادەباشیدا بن.

تەنگژەی سەر موسڵمانان بە گەلەکۆمەکردنی سەرجەم تاقمەکان لەسەریان گەلێک سەخت بوو، بە ناپاکیکردنی بەنی قورەیظە و پەیمانشکاندنیان و ئەو هەواڵەی کە لە دەستی «خەووات» و هاوەڵانیەوە پێمان گەشت لەبارەیانەوە بەر لە چەند ڕۆژێک؛ هێندەیتر سەخت بوو، گومانی بەهێز ئەوەیە کە لە یەکەم هەلدا کە بۆیان بڕەخسێت؛ لە پشتەوە هەڵدەکوتنەسەر موسڵمانان[1]، بەڵام گرفتەکە ئەوەیە کە موسڵمانان لە ئێستادا هەموویان سەرقاڵی هەڵکەندن، و پشت و ماڵ و حاڵیان بە هەرچی ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتەوە کە تێیدایە؛ لەژێر مەترسی دەستی ئەو هەرچی و پەرچییانەدایە ...

چی بکرێت؟

پێغەمبەر (ﷺ) بیری لە کارەکە کردەوە و ئەوجا بانگی لە «خەووات» کرد و قسەی لەگەڵ کرد.

---

(1) ئەو ئەسەرانە زۆرن کە ترسی موسڵمانان باسدەکەن لەو وەختەدا لە بەنی قورەیظە زیاد لە هەر شتێکی دیکە، تەنانەت جابر (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت: ترسمان لەسەر ماڵ و منداڵ لەناو مەدینە و لە بەنی قورەیظە زیاتر بوو وەک لە ترسمان لە قورەیش، هەتاکوو ئەوەی خوای گەورە دەرووی کردەوە.

«خەووات» دەفەرمووێت: «پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی لێ کردم وەختێک لە غەزای خەندەقدا گەمارۆدراوبووین، فەرمووی: بکەوەڕێ بەرەو بەنی قوڕەیظە و بڕوانە بزانە کەلێنێکیان لە گۆشەیەکەوە هەیە و ئەوجا هەواڵ بە من بدەیت. .».

لەوانەشە لەبەر سەختی ئەم کارەش بێت لەو کاتەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەسپێکەوە خستییەڕێ وەک هاریکارییەک لەسەر ئەرکەکەی، وەک لەلای «ئیبن ئەبی شەیبە»دا هاتووە، لە عیکریمەوە: «کە پێغەمبەر (ﷺ) «خەووات کوڕی جوبەیری» ناردە لای بەنی قوڕەیظە بەسەر ئەسپێکیەوە کە پێیدەوترا: جەناح!».[١]

«خەووات» دەفەرمووێت: جا لای خۆرئاوابوون بوو کە ئەوم بەجێهێشت، ئەوجا بە «سەلع»[٢]دا هاتمەخوارەوە، و کە خۆرم لێ ئاوابوو و نوێژی مەغریبم کرد، لەپاشان دەرچووم و بە «ڕاتیج»[٣]دا دەڕۆشتم، ئەوجا بەسەر «عەبدول ئەشهەل»[٤]دا، و پاشان بە «زوهرە»[٥]دا، و لەوەولاش بەسەر «بوعاث»[٦]دا، بەوەش «خەووات» چووە نێو زەویوزارەکانی بەنی قوڕەیظەوە، کە بوعاث کشتوکاڵیانە، و دەوترێت دوو میل لە مەدینەوە دوورە.

---

(1) انظر: «المصنف» (٣٤٣٣٠) وهو مرسل صحيح، وهو موصول عند الحاكم في «المستدرك» (٤٦٦/٣) (٥٧٤٧) عن ابن عباس به، والمرسل أصح.

(2) کێوی تەنیشت خەندەق-کەندەکەیە، کە موسڵمانان پشتییان لێیبوو.

(3) زنجیرە بەرزاییەکە کە ناوچەکەی پێناونراوە و کێوێکیشی تێدایە هەر بە هەمان ناو.

(4) واتە بەسەر گەڕەک و ماڵەکانیاندا، کە هۆزی سەعدی کوڕی موعاذن، و هاوپەیمانی بەنی قوڕەیظەن.

(5) زەوییەکی تەختاییە کە لە گەورەترین گوندەکانی سەر بە مەدینە دادەنرێت.

(6) زانیاری سەبارەت بەو ناوچانەم لە پەرتووکی «وفاء الوفا بأخبار المصطفى» للسمهودي، انظره: (٤/ ٣٠، ٨٩، ٧٠، ٧٨) بە ڕیزکراوی.

دەفەرمووێت: «وەختێک لێیان نزیکبوومەوە گوتم: "خۆمیان بۆ دادەشارم. خۆمداشارد و تاوێک چاوم لەسەر قەڵاکان بوو". واتە کاتێک چوویە ناو زەوییەکەیانە و نزیکبوویەوە لە قەڵاکانیان و، بێگومان کە ئەسپەکەی «جەناح»ی لەدووری شوێنی خۆداشاردنی دابەستووە بۆ ئەوەی ئاشکرانەبێت، ئەوجا خۆی لێ مەڵاسداون.

"ئیدی خەو بردمیەوە"، لێرەشدا دەکرێت هەندێک بەناموٚی ببینن و بڵێن: چۆن لە بارودۆخێکی وەهادا دەخەوێت؟

دەڵێم: ئەوەت بەسە کە چاوێک لە ناسۆری و نەهامەتی بینینی هاوەڵان بکەیت لە هەڵکەندنی خەندەقەکەدا هاوڕێ لەگەڵ برسێتی و سەرمای سەختدا، لەپاشان لەو حاڵەتەدا پێغەمبەر (ﷺ) بانگی لێبکات و پاچ و قازمەی دەستی دابنێت بۆ ئەوەی بەتەنیا بە ئەرکێک هەستێت.

بە کێوێکدا سەردەکەوێت و دێتەخوارێ و بە یەکێکی دیکەشدا سەردەکەوێت و دێتەوەخوارێ و ئەوجا بەپێ مەودایەکی دوورودرێژ دەبڕێت لە پێناو چاودێریکردنی دەنگوباس و جوستوجۆی ئەو خەڵکەی ئەوێ... لە ئێستادا جەستەی تەنیا دەیەوێت بەر زەوی بکەوێت وا بەریشیکەوت، هەندێک چاودێری کرد و ئیتر خەو بردییەوە، چەندەش جوانە ئەم دەربڕینەی... هەستدەکەیت خەو لە کۆتاییدا «خەووات»ی لەناو ئەم کۆشش و شەکەتییە بەردەوامەدا دۆزییەوە و بۆ دوور لەگەڵ خۆیدا بردی.

دەفەرمووێت: "هێندەم هەستکرد پیاوێک هەڵیگرتم کە من لە خەودا بووم، خستمیە سەرشانی و کەوتەڕێ!" وادیارە «خەووات» (ڕەزای خوای لێبێت) جەستە سووک بووە کە ئەو جوولەکەیە ئاوا بەئاسانی هەڵیگرتووە و داویەتی بەشانیدا، فەرمووی: "تۆقیم کە وا بە شانی پیاوێکەوەم بەڕێوەیە و دەمبات؛ ئیتر زانیم کە ئەوە یەک لە سیخوڕ و ئێشکگرەکانی بەنی

قورەیظەیە".

ئێستا هۆشبدە بە قسەکەی «خەووات»: "ئەوسات گەلێک شەرمەزارم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، کە ئەرک و بەرەیەک ڕایسپاردبووم پێی زایەمکرد".

ئەمەش لە مەزنی باوەڕی و چاودێریکردنیەتی بۆ پەروەردگاری و پێداگرییەتی لەسەر فەرمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، واتە یەکەم شت کە کەوتەوەبیری -ئەوە نەبوو کە تازە وا بووە بە دیل و بارمتە و لە بندەستیاندایە، بەڵکوو خەفەت و شەرمی ئەوە گرتیکە فەرمانی زایەکرد و بەسەر پاسەوانییەوە خەوی لێکەوت-.

فەرمووی: "ئەوجا یادمکەوتەوە کە چۆن خەوبردمیەوە و کابراش بەهەڵەداوان بەرەو قەڵاکانیانم دەبات و کە بەزمانی جوولەکانیش قسەیکرد ئیدی زانیم، گوتی: مژدەی گیسکێکی قەڵەوت لێبێت[1]، منیش هەر دەستمم دەکوتا و دەشەکاندەوە[2]، ئەوەی منیش ناسیبمن [جوولەکەی مەدینە] کەسیان نایەتەدەرەوە مەگەر پاچێکی بەناوقەدیەوە بەستووە.

هێندی نەبرد دەستم خستەسەر پاچەکە و دەرمهێنا، ئەویش بە قسەی پیاوێکەوە سەرقاڵبوو لە سەر قەڵاکەوە، کە دەرمهێنا ڕاست کردم بە جەرگیدا، لێیکەوت و ناڵاندی: "السَّبُع- دڕندە!"[3]

---

(1) چۆن بڵێیت خەووات ئەوەندەی لە زمانی جوولەکە [عیبری] دەزانی، و تێگەشت کە کابرا لەگەڵ خۆیدا قسەدەکات، یاخود بەدەنگی بەرز هەواڵ بە یەکێک دەدات لەسەر شوورای قەڵاکانەوە، لە خۆشی ئەو نێچیرەوە کە بەدیلیگرتووە و هێناویەتی.

(2) واتە: خۆیکردووە بە خەوتوو و دەستی کوتاوە بەسەر کەمەری کابرادا، وەک خەوتوویەک کە هەموو جەستەی شلبۆتەوە و دەستی درێژبووە.

(3) واتە: دڕندە خواردمی، وایزانی شێرێک دڕندەیەکی ئەو هەردە هەڵیدڕیوە، و وا دەیخوات.

ئیدی جوولەکە بە پەلی دارخورما ئاگریانکردەوە، و ئەویش مرد، منیش لێیانەوە دیارنەبووم و کەسم پێنەدەگەشت، هەر لەو ڕێیەوە کە هاتبووم گەڕامەوە».

بڕوانە لەم «خەووات»ە قارەمانە کە وەختێک بەخۆیزانی کابرا بەسەر شانیەوە دەیبرد، بیریکردەوە و ئەندازەگیریکرد و هێمنانە جووڵایەوە هەتا ئەوەی کە خۆی هەر بە خەوتوو نیشاندا و دەستی شلکردبۆوە لەشێوەی کەسێک کە لە خەودا ڕۆچووبێت بۆئەوەی دەستی بە پاچەکە بگات، شارەزاییەکیشی بە زمان و سەروسیپاڵیان هەبوو، هەتاکوو دەستی بە پاچ گەشت و لە کەمەری کابرای کردەوە و کوشتی پێی، و بێوەی و بێدەنگ گەڕایەوە.

«خەووات» دەفەرمووێت: جبریل هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وهەواڵی پێدا، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: "خەووات بردتەوە"!

ئەوجا دەرچوو و هەواڵی بە هاوەڵانیشی دا، فەرمووبووی: «خەووات» وای بەسەرهاتووە و وای کردووە، منیش گەشتمە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دانیشتبوو لەناو هاوەڵانیدا و قسەیاندەکرد، جا وەختێک منی بینی فەرمووی: "أفلح وجهُك - سەرفرازبوویت، ڕووسووربوویت".

گوتم: تۆش سەرفرازیت ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: باسی خۆتم بۆ بگێڕەوە، منیش بۆم گێڕایەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: "جبریلیش ئاوا بۆی گێڕامەوە"، خەڵکەکەش گوتیان: پێغەمبەری خواش (ﷺ) وا بۆی گێڕاینەوە.[1]

بەڵێ؛ ژیانی سەرڕاستانەیان ئاوا بوو، هەوڵ و سەختی و کاری بەردەوام

---

(1) انظر: «المغازي» للواقدي (٢/ ٤٦٠، ٤٦١)، وذكره ابن منده مختصراً في «المستخرج» (٢/ ٢١٦)، ونحوه في «إمتاع الأسماع» للمقريزي (١/ ٢٣٣).

بۆ بەرپاکردن و داچەسپاندنی ئایین و دامەزراندنی ئەم نموونە مرۆییە زیندووە کە هەتا ڕۆژی دوایی بە مەشخەڵ دەمێنێتەوە، کە خەڵک هەموو شتێکی پێ دەپێون، لە یەکەم هەڵسوکەوتە مرۆییەکانیان و کارە ئایینییەکانیان، و پێویستییە ڕۆحییەکانیان و، حاڵەتە دەروونییەکانیانەوە، هەتا کۆتایی ئەوە.

## دیمەنەکانی بونیادنان

به کۆتاییهاتنی غەزای خەندەق، و پاش ئەوەی کە پەروەردگار تاقمەکانی بە داخی دڵی خۆیانەوە لووتشکاند و گەڕاندەوە و شەڕی لەکۆڵ موسڵمانان کردەوە ... «خەووات» دەچێتە ناو قۆناغێکی تازەوە لەو دیمەنانەی کە تێیاندا موسڵمانان لە قۆناغی بنچینەسازی و ناچارکردنی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بە داننان بە دەوڵەتە نوێیە تازە سەرهەڵداوەکە و مافی ڕەوای لە دیاریکردنی شووناس و هەژموونی خۆیدا و پاککردنەوەی ناوچەکانەوە، بەرەو قۆناغێک دەچوون کە ناونیشانەکەی؛ ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو وەختێک فەرمووی: "وا ئیتر ئێمە دەچینەسەر ئەوان نە ئەوان بێنەسەر ئێمە... ئێمە بۆیان دەکەوینە ڕێ!"[1]، سا یەکەم کەوتنەڕێی کرداری بەرەو:

## حودەیبییە و پاش حودەیبییە:

ساڵێکی تەواو بەسەر غەزای ئەحزابدا تێپەڕی، ئێستا ئێمە لە ذولقەعیدە-داین(٦ک)، کە «خەووات» و هاوەڵانی لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) دەرچوون بەنیازی حەرەمەوە، لە چوارچێوەی مافی ڕەوای خۆیان

---

(1) انظر: صحيح البخاري (٤١٠٩).

وەک «دەوڵەتێک»ی داچەسپاو کە شکۆ و لەشکر و سنوور و داستان وجەنگ و سەرکەوتنی خۆی هەیە، وەک بڵێیت ئەم گەشتە وەرگێڕانێک بوو بۆ بڕگەی دووەمی فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (ﷺ): «ئێمە بۆ ئەوان دەکەوینەڕێ!».

## گەشتن بە شانازییەکان

لەم قۆناغەدا دیمەنگەلێکی زۆر ڕوودەدەن کە زۆربەیان دیمەنی چەسپاندن و پاڵپشتی بوون لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ موسڵمانان، فرە شانازی و نازناویان بوو بە بەشیان لەم گەشتەدا، «خەووات»یش بە پشکی گەورە تێیدا بەشداربوو، لەوانە:

- پێغەمبەر (ﷺ) وەختێک لە حودەیبییە بوون پێی فەرموون: «کێ دەچێتەسەر ئەم بەرزاییە، بەرزایی موراڕ، چونکە هێندەی لە تاوانی بەنی ئیسرائیل بوردرا لێی دەبوردرێت و دەبەخشرێت!»، واتە: پەروەردگار لە گوناهەکانی خۆشدەبێت وەک بەڵێنی بە بەنی ئیسرائیل درابوو، ئەوجا «خەووات» لەگەڵ هاوەڵانی دیکە چوونەسەر بەرزاییەکە و پەرورەدگاریش لێیانخۆشبوو.

- کاتێک «عوسمانی کوڕی عەففان» (ڕەزای خوای لێبێت) دەنگوباسی نەما و دەنگۆی ئەوە هەبوو کە کوژرابێت، و پێغەمبەر (ﷺ) خەڵکی بانگکرد بۆ پەیماندان، ئەوکات «خەووات»یش لەوانە بوو کە پەیمانیان بە پێغەمبەر (ﷺ) دا لەژێر درەختەکەدا، و فەرمایشتەکەی پەروەردگاریش دابەزی: ﴿۞ لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾ [الفتح: ١٨] واتە: بەڕاستی کە پەروەردگار لە باوەڕداران ڕازیبوو وەختێک پەیمانیان بە تۆ دەدا لەژێر

درەختەکەدا، جا زانی کە چی لە دڵیاندا هەیە، سا ئارامی و ئۆقرەگری دابەزاندە سەریان و بە فەتحێکی نزیک پاداشتیدانەوە.

بەو مانایەیی دڵارامی و پێچەسپانی دابەزاندە سەریان سەبارەت بەو ئاییندارى و چاوڕۆشنییە بە حەق کە ڕێنومایيکردبوون بۆی، جا ئەو ڕەزامەندییە «خەووات»یشی گرتەوە کە لە هاوەڵانی درەختەکە بوو.[1]

- هەروا لە دوو صەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژی حودەیبییە پێی فەرموون: "ئێوە باشترینی خەڵکی سەر زەوین"[2]، ئەو پایە بڵندەش ئەوی گرتەوە لەگەڵ هاوەڵانی دیکەی حودەیبییەدا.

- لە صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: «ناچێتە دۆزەخەوە پیاوێک ئامادەی بەدر و حودەیبییە بووبێت»، «خەووات»یش (ڕەزای خوای لێبێت)، وەک زانیمان «حوکمی» بەدری هەیە، بەویستی غەزای ڕێگەی خواوە بۆ بەدر دەرچوو، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) گەڕاندییەوە بەهۆی پێکرانیەوە لە پێیدا، و پشکی خۆشی لە دەستکەوتەکان بۆ دانا، هەروەها پاداشتیشی، لێرەشدا ئامادەی حودەیبییە بوو، سا بە میهر و بەخشش و ڕەزامەندی پەروەردگار بەو مەنزڵەش گەیشت.

بەمشێوەیە ڕۆژەکان لە حودەیبییە تێدەپەڕین، ئەویش لەپاش وتووێژگەلێکی دوورودرێژ دواییهات کە ئاگربەستێکی لە نێوان قوڕەیش و پێغەمبەردا (ﷺ) هێنایەکایەوە، و موسڵمانانیش گەڕانەوە بەمەرجی ئەوەی کە ساڵی دواتر بگەڕێنەوە بۆ بەجێهێنانی عومرە.

---

(1) انظر: «تفسير الطبري» (٢١/ ٢٧٧).

(2) أخرجه: البخاري (٤١٤٥)، ومسلم (١٨٥٦).

## فەتحی ئازادی

سەرەڕای بەدەستهێنانی هەرچی مژدە و شانازی و نازناو هەیە کە لە حودەیبییەدا بوو بەشیان؛ بەڵام بە خەفەتێکی گەورەوە گەڕانەوە، ئەوەتان «خەووات» و هاوەڵەکانی لە ڕێگەی گەڕانەوەیاندا بۆ حودەیبییە خەمۆکی و داخ دایگرتوون، کە ڕێگری گەشتن بە حەرەم و لانکەی دڵانیان لێکرا، زیاد لەوەش ئەو بێویژدانییە گەورەیەی کە لە بەندەکانی ئاشتەواییەکە لەگەڵ قورەیشدا بەرانبەریان کرا [وەک وایاندەزانی]، جا پەرورەردگاریش ویستی هەموو ئەوە لە دڵیان بشواتەوە کە دەسپێکی سوورەتی فەتحی دابەزاند:

﴿إِنّا فَتَحنا لَكَ فَتحًا مُبينًا۝١ لِيَغفِرَ لَكَ اللَّهُ ما تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَما تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعمَتَهُ عَلَيكَ وَيَهدِيَكَ صِراطًا مُستَقيمًا۝٢ وَيَنصُرَكَ اللَّهُ نَصرًا عَزيزًا﴾ [الفتح: ١ - ٣ ] واتە: «بەڕاستی کە ئێمە فەتحێکی ئاشکرا و یەکلامان بە تۆ دا. تاکوو پەروەردگار ئەوەی پێشچووە لە گوناهت و ئەوەی پاشچووە لێتخۆشبێت و بەخششی خۆیت بەسەردا تەواوبکات و ڕێنومایی ڕێگەیەکی ڕاستت بکات وە پەروەردگار بە سەرکەوتنێکی چەسپاو و سەربەرز سەرت بخات.»

جا فەرمووی: «بەڕاستی ئایەتێکم بۆ سەر دابەزیوە کە لە تەواوی دونیا بەلامەوە خۆشەویستترە». هاوەڵانیش فەرموویان: پیرۆزت بێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، خوای گەورە لێی ڕۆشنبکردوویتەتەوە چی لەگەڵ تۆدا دەکات، ئەی لەگەڵ ئێمەدا چی دەکات؟

ئەنجا پەرورەدگاریش ئەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿لِيُدخِلَ المُؤمِنينَ وَالمُؤمِناتِ جَنّاتٍ تَجري مِن تَحتِهَا الأَنهارُ خالِدينَ فيها وَيُكَفِّرَ عَنهُم سَيِّئاتِهِم وَكانَ ذلِكَ عِندَ اللَّهِ فَوزًا عَظيمًا﴾ [الفتح: ٥] واتە: «تاکوو [پەروەردگار] باوەڕدارانی پیاو و ژن بخاتە بەهەشتانێکەوە کە ڕووبارەکان بەژێریدا دەڕۆن بە نەمری و هەتاهەتایە تێیدا وە لە تاوانەکانیشیان خۆشبێت ئەوەش بەلای

پەروەردگارەوە بردنەوەیەکی گەلێک گەورەیە.»[1]

ئاوەها وەک بڵێیت پەروەردگار ویستی شتێکیان لە پەردەی پەنهانەکان بۆ هەڵبداتەوە و هەواڵیانبداتێ کە لەسەر ڕێگەی ڕاستن و بۆچوون و تێڕوانینەکەی پێغەمبەریش (ﷺ) لە بەندەکانی ئاشتەواییەکەدا؛ سەرەنجامەکەی فەتحی بڕاوە و تەواو و سەرکەوتنی یەکلاکەرەوەیە کە ئیدی لاوازی بەشوێندا نایەت، هەروەها مژدەی فەتحێکی نزیکیشی پێدان لەپاش گەڕانەوەیان لە حودەیبییە.

وەهاش بەدیار بوو کە ئەمساڵ (٧ک) سەرەتای ئەو فەتحە گشتییە و نیشانەی فەتحە مەزنەکەیە کە موسڵمانانساڵەهای ساڵە چاوەڕوانیدەکەن، هەر واش بوو...لەگەڵ چوونە ناو ساڵی حەوتەمدا، و لە مانگی موحەڕڕەمدا مژدەی فەتحە نزیکەکە هاتەجێ، کە زۆرینەی زانایانی تەفسیر دەفەرموون کە فەتحە نزیکەکە: خەیبەر بوو!

خەیبەریش کە قەڵاکانی لانکەی پیلانگێڕی و ئاژاوەسازی بوو بەدرێژایی ساڵانی ڕابردوو، هەروەها پەناگەی سەرجەم ناپاکانی دەربەدەرکراوی جوولەکە بوو لە بەنی قەینوقاع و نوضەیر و قوڕەیظە؛ بگرە ژووری ئۆپەڕاسیۆنەکانی جەنگ و گێچەڵە سەربازییەکان بوو کە بەدرێژایی ئەم ساڵانە موسڵمانانیان سەرقاڵکردبوو، کە دواهەمینیشیان نەهامەتی خەندەق و گەلەکۆمەی ئەحزاب بوو.

ئێستا ئەم ئاگربەستە ڕێگەی خۆشکرد بەرەو فەتحی خەیبەر، بۆ کۆتاییهێنان بە سەرجەم ئەم هەڕەشانە، هەروەها بزاوتنێکی ئازادانەتر و تێکۆشان بۆ بانگەوازیکردن بۆ ڕێگەی پەروەردگار، بەبێ ترس و دڵەڕاوکێی هەمیشەیی لە پیلانگێڕییەکانی جوولەکە کە وەستانی بۆ نەبوو.

---

(1) انظر: «تفسير الطبري» (٢٢/ ٢٠٠).

«خەووات» ئەمساڵ بە کۆمەڵێکی زۆر دیمەندا تێپەڕدەبێت: گرنگترینیان:

«فەتحی خەیبەر»، و «غەزای دووەمی ذاتو ریقاع»، کە شوێنێکە لەلای نەجد، پێغەمبەر (ﷺ) زیاد لە جارێک بۆی دەرچووە، بەناوبانگترینیان ئەوەیە کە بە «غەزای نەجد» ناودەبرێت، یاخود «ذاتو ریقاعی یەکەم» (٤ک).[١]

بەمشێوەیە «خەووات» لە سەرجەم غەزاکانیدا لە سایەی هاوەڵێتی پێغەمبەردا (ﷺ) بوو وەک یەکێک لە سوارچاکە ئازاکانی، ڕۆژەکانیش خێرا تێپەڕبوون و فەتحە مەزنەکە هات (٨ک)، لەپاشان کۆتا غەزاکان بەرەو تەبووک (٩ک)، ئەوجا حەجی ماڵاوایی پێغەمبەر (ﷺ) لە ذولقەعیدەی (١٠ک)دا، ئیدیش کۆتاییهاتنی گەشتی پیرۆزی پێغەمبەری لە ڕەبیعول ئەووەلی (١١ک)دا، کە ئەوکات دەیەی پێنجەمی تەمەنی «خەووات» گەشتبووە نیوەی.

ئیدی «خەووات» ئا بەمشێوەیە لە سایەی پەروەردەی پێغەمبەریدا ژییا، زۆری لێوە فێربوو، لەسەر زۆر شتیش پەروەردەبوو، بەهەمان ڕێڕەوی ڕاست لەگەڵ جێنشینەکانیشیدا ژییا، لە جانشینێتی «ئەبو بەکری سدیقدا» ژییا، ئەوجا هەر زوو «سدیق» کۆچیکرد لە پاش نزیکەی دوو ساڵ و نیو لە کۆچی هاوەڵەکەی (ﷺ)، ئیدی «عومەری کوڕی خەتتاب» لەدوای دوو هاوەڵەکەیەوە ئاڵاکەی گرتەدەست، «خەووات»یش لەگەڵ ئەو و ڕاشیدینی پاش ئەویشدا ڕۆشت و بەردەوامبوو.

---

(1) بەدرێژی لەسەر ذاتو ریقاعی یەکەم(٤ک) و دووەم(٧ک) و ئەو ڕووداوانەی لە هەر یەکێکیاندا ڕوویانداوە نووسیومە، لە پەڕاوەکەی: جابری کوڕی عەبدوڵڵا لە سایەوسێبەری پەروەردەی پێغەمبەریدا، کە ئەڵقەی چوارەمی ئەم زنجیرەیەیە.

## وەستانێک لەگەڵ گێڕانەوەکانیدا

لە ئامرازەکانی ناسینی کەسایەتییەک ئەوەیە کە بڕوانین لە هەڵبژاردن و گرنگیپێدانەکانی و ئەو وشانەی لێوەی بۆمان بەجێماوە؛ چونکە هەڵبژاردنەکانی مرۆڤێک بەشێکن لە عەقڵ و ئاوەزی ئەو مرۆڤە.

جا ڕاوی یان ئەوە لەبەردەکات کە تایبەتە بە خۆیەوە و پێویستی پێیەتی، یاخود لەبەرکردنی ئەسڵەن هەر لەپێناو کۆکردنەوەی گێڕانەوەکان و پاراستنی فەرمووده و ویستنی زانستە، لەوانەشە هەردووکی لە کەسێکدا کۆببێتەوە، جا لە لایەکەوە فێرخوازی زانست بێت و لە لایەکی دیکەشەوە زیاتر ئەوەی لەبەرکردبێت کە پێوەندی بە خۆیەوە هەیە و تایبەتە پێوەی.[1]

هەربۆیە دەبینیت بەناوبانگترین گێڕانەوەکانی «خەوات» سەبارەت بە نوێژی جەنگە «صلاة القتال»، یاخود ئەوەی بە بە نوێژی ترس «صلاة الخوف» ناودەنرێت، ئەمەش بێگومان ڕەنگدانەوەی گرنگیپێدانەکانی «خەوات»ە، چۆن وا نابێت وەختێک کە ئەو یەکێک لە پاڵەوانانی پێغەمبەرە (ﷺ) و ئامادەی سەرجەم ڕووداو و جەنگەکان بووە و بگرە هێندە تەمەنی درێژبوو هەتا ئەوەی کە ڕووداوەکانی ئاشووبە گەورەکانی نێوان هاوەڵانیشی ڕەزای خوایان لێبێت دی، لە سووپاکەی عەلی-شدا بوو (ڕەزای خوای لێبێت).

---

(1) نموونەی ئەوە: کاتێک ئیبن عومەر فەرموودەیەک دەگێڕێتەوە کە فەرماندەکات بە کوشتنی سەگ، جگە لە «سەگی ڕاو» یان «سەگی مەڕوبزن یان ماڵات». جا پێی گوترا: ئەبو هورەیرە دەڵێت: «یان سەگی کشتوکاڵ». ئیبن عومەر فەرمووی: «ئەبو هورەیرە خۆی کشتوکاڵی هەیە»! واتە: ئەبو هورەیرە ئەو زیادەیەی لەبەرکردووە و لەبیرماوە چونکە خۆی پێویستی پێ بووە، کەسێکیش هەتا خۆی پێویستی بە شتێک بێت سوورترە لەسەری و ئاگادارترە لێی، هەربۆیە پێشەوا نەوەوی دەفەرموێت: «داب هەر وایە کە ئەو کەسەی هەستان و دانیشتنی لەگەڵ شتێکدا هەبوو؛ وەها لەو شتە دەزانێت و ووردبین و تۆکمەکارە تێیدا و حوکمانێکی بۆ دەردەکەوێت لەسەری کە جگە لە ئەو وا بۆی دەرناکەوێت».
ینظر: شرح مسلم، النووي، (١٠/٢٣٦).ـ

لەسەر نوێژی ترسیش، خوای گەورە ئایەتەکانی سوورەتی نیساء-ی دابەزاند، ئەو شێوازەی بۆ تەشریعکردن کە گونجاو بێت نوێژی پێ بکەن لەکاتێکدا کە لە گۆڕەپانی جەنگیشدان، فەرموودەکەی «خەووات»یش هەر سەبارەت بەو نوێژەیە، پێشەوا «بەیهەقی» لە «سونەن»ەکەیدا هێناوێتی بە سەنەدیەوە هەتا دەگاتە لای «سالیحی کوڕی خەووات»، لە باوکییەوە کە فەرموویەتی: «پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی ترسی کرد، جا کۆمەڵێکی لە پشت خۆیەوە ڕیزکرد، کۆمەڵێکیش ڕووەو دوژمن، جا یەک ڕکات نوێژی بەوانە کرد کە لەگەڵیدا بوون، ئەوجا هەستایەوە و ئەوانیش هەستان و بۆخۆیان تەواویانکرد، ئەوجا چوونە جێی ئەو هاوەڵانەیان [ئەوانەی ڕووەو دوژمن بوون]، ئەوانیش هاتن و پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ڕکاتەی کە مابوو بەوانی کرد، ئەوجا ئەوانیش بۆخۆیان تەواویانکرد».(١)

بنەڕەتی ئەم فەرموودەیەش لە دوو صەحیحەکەدایە، و تێیدا هاتووە «لە سلیحی کوڕی خەووات»ەوە لە یەکێکەوە کە ڕۆژی «ذات الرقاع» لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) نوێژی ترسی کردووە، کە کۆمەڵێک ڕیزبوون.» (٢)

پێشەوا «نەوەوی» دەفەرمووێت: "نوێژ لەگەڵ کراوەکە؛ «خەووات»ی باوکی خۆیەتی"، حافظ لە «الفتح» دا دەفەرمووێت: "ڕای بەهێز وایە کە ئەوە هەر «خەووات»ی باوکی بێت...ئیبن موندە لە «معرفة الصحابة»دا لە ڕێگەی ئەوەوە هێناوێتی، هەروەها بەیهەقیش هێناوێتی، نەوەویش لە «التهذیب»ەکەیدا یەکلا و پێداگرانە پێی وایە کە ئەوە «خەوواتی کوڕی جوبەیر» ".

لە ئەسەرە بەردەستەکانیشی فەرمایشتەکەی سەبارەت بە جۆرەکانی خەو، کە دەفەرمووێت: "خەوی سەرەتای ڕۆژ: کەودەنییە، ناوەڕاستەکەشی:

---

(1) «السنن الكبرى» للبيهقي (٣/٣٥٩) (٦٠٩١).
(2) البخاري (٤١٢٩)، ومسلم (٨٤٢)، واللفظ له.

سرووشتییە، کۆتاییەکەشی: گەمژەییە!".

ئەم فەرموودەیەش لەگەڵ ئەوەدا کە کورتە، بەڵام بە شێوەیەکی زۆر ڕاستاڵانە ئەو کەسایەتییە چالاکە گورجە نمایشدەکات، کە دەفەرمووێت (ڕەزای خوای لێبێت):

خەوی سەرەتای ڕۆژ: خُرْق-کەودەنییە، لە خَرَق-ەوە هاتووە، پێشی دەوترێت «نَومة الخُرْق»خەوی کەودەنی، کە خەوی وەختی چێشتەنگاوە، وتراویشە: کە مرۆڤ لە کاری دونیا و دوارۆژیش سەرقاڵدەکات و دوایدەخات، بەڵگەشە لەسەر کەم عەقڵی و تەمبەڵی.

ناوەڕاستی ڕۆژیش: بە خُلْق و خُلُق-یش نووسراوە، واتە: لە سرووشت و پێکهاتەی مرۆڤدا هەیە، کە هەمان ئەو خەوی قەیلوولە-یەیە کە لە سوننەتدا هاتووە و هاوەڵان زۆر گرنگییان پێداوە.

کۆتایی ڕۆژیش: حُمْق-گەمژەییە، گەمژەییش دانانی شتێکە لە غەیری شوێنی خۆیدا، وتراویشە: خەوی عەسرانەیە، بەوە لێکدراوەتەوە کە «دەرچوون و بڵاوبوونەوەی جنۆکەکان لەو کاتەدایە».

ئیدی تەنیا خەوی بەیانیان «الصُّبحة» دەمێنێتەوە. . کە ئیبن قەییم لەسەری دەفەرمووێت:

«خەوی بەیانیان ڕێگەی ڕۆزی دەبەستێت؛ چونکە لەو کاتەدا سەرجەم بوونەوەران بەدوای ڕۆزیدا دەڕۆن، وادەی بەشکردنی ڕۆزییە، جا خەوتنی ئەو وەخت نەگبەتی و بێبەشییە مەگەر لەبەر پێشهات یاخود پێویستییەک، زۆر زۆریش بەزیانە بۆ جەستە».

گوتم: بێگومان کە هەموو ئەمە لەسەر بنەڕەتەکەی وایە، وەگەرنا لە لێکدانەوەی ئەو فەرمایشتەی پەروەردگاردا: ﴿إِنَّ لَكَ فِي النَّهارِ سَبحًا طَويلًا﴾

(المزمل: ٧) واتە: «بەڕاستی کە تۆ لە ڕۆژدا دەستگیران و سەرقاڵییەکی دوورودرێژت هەیە.»

«سَبحًا طَویلًا» واتە: بۆشاییەکی درێژت هەیە بۆ خەوتن و پشوودان، جا با سەرقاڵی شەوت بۆ پەرستش بێت، بە نوقتەداریش خوێنراوەتەوە، «سبخاً»: واتە خەو، تسبیخ: خەوی قووڵە.

ئەم داناییەش کە لەسەر زمانی «خەوات» گەڕاوە، لە جگە لەویشەوە و بە شێوازگەلی دیکەی لێک نزیک هاتووە، بەڵام وەک لە پێشدا باسکرا، ئەوەی کە گرنگی پێداوە و لە سرووشت و خووی خۆیەوە نزیک بووە؛ ئەوەی لێوە ناسراوە و بەناوبانگ بووە.

هاوڕای داناییەکەی، شاعیریش بوو، دەنگ خۆش. شیعری زۆری هەن کە لێرە و لەوێی پەرتووکەکانی ژیاننامەکان و شیعردا پەرشوبڵاو دەدیترێنەوە، لەلای پێشەوا بەیهەقییەوە هاتووە بە سەنەدیەوە، لە «خەووات»ەوە (ڕەزای خوای لێبێت)، دەفەرمووێت: «بۆ حەج دەرچووین لەگەڵ «عومەری کوڕی خەتتاب»دا، گوتی: جا لەناو کۆمەڵێکدا ڕێماندەکرد «ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح» و «عبدالرحمن ی کوڕی عەوف»یشی تێدا بوو ڕەزای خوایان لێبێت، جا کۆمەڵەکە گوتیان: «خەووات» شیعرمان بە ئاوازەوە بۆ بڵێ، جا ئەویش بۆی گوتن.

گوتیان: ئەوەمان لە شیعرەکانی ضیراڕ بۆ بڵێ!

«عومەر»یش (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی: باوکی عەبدوڵڵا لێگەڕێن لە بەری شیعری دڵی خۆیمان بۆ بڵێت.

«خەووات» گوتی: بەردەوام بووم هەتا بەرەبەیانمان بەسەردا هات و «عومەر» گوتی: «خەووات» زمانت گلێرکەرەوە وا بەرەبەیانە.

«ئەبو عوبەیدە» (ڕەزای خوای لێبێت) گوتی: "وەرنە لای پیاوێک کە هیوام وایە لە «عومەر» خراپتر نەبێت، جا من و «ئەبو عوبەیدە» کەوتینە لاوە و دەستمان پێکردەوە و بەردەوام بووین هەتا نوێژی بەیانیمان کرد".

لەم ئەسەرەدا دیمەنێکی مەزن لە دیمەنەکانی ئەو ژینگە هاوسەنگە ڕێکوپێکە کێشراوە، کە چەندێک لەگەڵ خۆیاندا ڕاستگۆ بوون تەنانەت لە پشوو بە خۆدان و لابردنی وەڕەزیشدا، وە چەندێک یەکتریان خۆشویستووە، و ڕێزی یەکیان لەلا بووە، لەگەڵ ئەوەشدا کەسیان بە بت نەدەکرد، تەنیا لەبەر ڕای یەکێک یەکێکی دیکەیان نەدەشکاند و ڕێلێبگرن، جێی خۆیەتی سەرت بسوڕمێت لە تێگەشتنی پێشەوا بەیهەقی و ناونیشان نووسینی بۆ ئەم ئەسەرە کە نووسیویەتی: «باسێک: ڕێگە لە یەکێکیان ناگیرێت کە شتێک لە شیعر و جگە لەوەش بڵێت مادەم تاوانی تێدا نەبێت!»، چەند ئەسەرێکیش دێنێتەوە، کە بنچینەی هەموویان ئەم ئەسەرەی «خەووات»ە، ئەم ناونیشان و ڕێکخستنە ئیلهامبەخشەشی لەسەر نووسیوە، وەک ئەوەی بڵێت: مادەم شتێک حەڵاڵ بێت و تاوانی تێدا نەبێت نابێت لە کەس تەسکبکرێتەوە، یاخود ڕێگەی قسە یان شیعر یان جگە لەوانەی لێ بگیرێت، مادەم مەرجەکە هاتبێتەجێ، کە بریتییە لە نەبوونی تاوان و خراپە تێیدا «بما لا إثم فيه».

لێرەشدا «خەووات»، کە ئەو کۆمەڵە لەسەر ڕێگەی سەفەر داوایان لێکرد کە بە هەندێک شیعر وەڕەزییان لابدات و درێژی ڕێگەیان لێ بڕوات، چۆن بڵێیت لە ڕێ لایاندابێت بۆ پشوودان و ئالیکدانی ئاژەڵەکانیان و هەڵسووڕاندنی کاروباری خۆیان، لەناو ئەو خەڵکەشدا هاوەڵانی مەزنی تێدابوو وەک «عومەری کوڕی خەتتاب» کە ئەوکات جێنشینیش بوو، لەگەڵیشیاندا ئەمینداری ئوممەت «ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح» و هاوەڵی ڕەسەن و ماقووڵ «عبدالرحمانی کوڕی عەوف» و جگە لەوانیش

ڕەزای خوایان لێبێت.

جا کاتێک خەڵک داوای شیعری ضیراڕیان لە «خەووات» کرد. .

ضیراڕیش لێرەدا یان «ضیراڕی کوڕی ئەزوەڕە»، یاخود «ضیراڕی کوڕی خەتتابی فیهری»یە، ڕەزای خوایان لێبێت، کە هەردووکیان هاوەڵن و لەپاش فەتح موسڵمانبوون و هەردووکیشیان شاعیرن. دوو سیمبولی سەرسامکەر بوون لە ئازایەتی و سوارچاکێتیدا، باسوخواسیان لە توێی پەرتووکەکانی ژیاننامەکاندا ناوازە و چێژبەخشن، پاڵەوانێتی زۆریان لەوێدا تۆمارکراوە.

جا «عومەری فارووق» پێی فەرموون: "لە باوکی عبدالله گەڕێن با لە بەری دڵی خۆی بڵێت". واتە: لە شیعری خۆی، لێرەدا وادەردەکەوێت کە «خەووات» لە ئاستێکی وەها جوانکاری [تۆکمەسازی هونەری] دا بووە کە «عومەر» (ڕەزای خوای لێبێت) بڵێت کە دەبێت لە شیعر و بەرهەمی سینەی خۆت بۆمان بڵێییت.

بەڵێ، ڕۆژگارێک کە شاعیران سوارچاک و ئازا و پاڵەوان و قوربانیدەر بوون؛ دەبینیت کە لە وێنەی «خەووات» و ضیراڕ و ضیراڕەکەی دیکە و کەعب و ئیبن ڕەواحە بوون، هەستدەکەیت بەو ڕێزگری و سامدانانە لە فەرمایشتەکەی «عومەر»دا کە «خەووات» بە کونیەکەی ناودەبات، کە کونیەکەی «باوکی عبدالله »، و «باوکی صالح» بوو.

ئێستەش لێرەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەم ژینگە پێوەرییە، «عومەر» -بە نەریتی خۆی لە پێداگری و ڕێککاریدا- بە «خەووات» دەڵێت: بەستە، تەواو، وا بەرەبەیانمان لێ هات، با هەرکەس کە دەیەوێت ویترێک بکات یاخود ئەوەندەی کە ماوەتەوە لە شەو نوێژبکات و یان کەمێک بخەوێت و دواتر گورجوگۆڵانە بۆ نوێژی بەیانی و کارەکانی خۆی هەستێت...لێرەدا

ASTANA

ئەمینداری بەوەفا و خاوەن دەروونی پاک و چاک «ئەبو عوبەیدە» دێتە ناو دیمەنەکەوە و دەڵێت: "وەرنە لای پیاوێک کە هیوام وایە لەعومەر خراپتر نەبێت".

یانی وەک بڵێیت «ئەبو عوبەیدە» لەگەڵ هەندێک لەوانەی کە دەیانویست دانیشتنەکەی «خەووات» تا سەر بەرن و تەواویبکەن هەستان، خۆ هەموو خەڵک نایانەوێت ئێستا بخەون، لەوانەشە هەندێکیان ئەسڵەن سەرەتای شەو ویتری خۆیانیان کردبێت و کاری ئەوەیان نەمابێت، کەواتە مادەم تاوانیشی تێدا نییە ئاساییە. هەروەکوو بەیهەقی ناونیشان و سەربابەتی بۆ ئەم ئەسەرە نووسیوە، هەروەها لە دەقەکەدا دەبینیت کە چۆن «ئەبو عوبەیدە» (ڕەزای خوای لێبێت) ویستی کە هەر گومان و تێگەشتنێکی هەڵە لە «خەووات» لابدات کە لەوانەیە لە دڵی هەندێکدا درووست ببێت. بۆ نموونە بڵێن «عومەر» ئەمە دەڵێت و دەیەوێت سوودی وەختی بەرەبەیان گلبداتەوە، کەچی «خەووات» هەر خەریکی شیعر و ئەو بەزمانەیە، جا ئەمینداری ئوممەت ویستی هەموو ئەمە لابدات بەو ڕوونکردنەوە بەسۆزەی کە دای بەگوێی ئەوانەدا کە ویستیان دانیشتنەکە تەواو بکەن. وەرە، لات ئاسایی بێت، وەرە بۆ لای پیاوێک مەبەستی «خەووات»ە، کە هیوام وایە لە وێنەی «عومەر» بێت لە حەزکردن بە حەق و چاکە، کورتبڕییەکەی «عومەڕی کوڕی خەتتاب» و درێژەپێدان و تەواوکردنەکەی «خەووات»یش، مانای ئەوە نییە کە کەمتەرخەمییەک لەوەدا هەیە.

سوێند بەخوا ئەمەش گەواهیدانێکی مەزن و شانازییەکی گەورەیە بۆ «خەووات» (ڕەزای خوای لێبێت)، بەتایبەت کە لەلایەن ئەمینداری ئوممەتەوە بێت (ڕەزای خوای لێبێت).

هیوام وایە لە سەروبەندی ماڵاواییکردنماندا لەم دیمەنە، ئەوە بێنیتە

ASTANA

پێش چاو کە «عومەری کوڕی خەتتاب» ئەوکات جێنشینی باوەڕداران بوو وە فەرمانی بە یەکلایی وەردەگیرا، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک خۆیان دایە لا و دانیشتنەکەیان تەواوکرد، بەبێ هیچ ترسێک لە هەر خۆسەپێنی یان دژایەتیکردنێک لە چەسپاندنی بیر وبۆچوونەکاندا.

لێرەدا هۆشیارییەکی گرنگیش هەیە کە پێویستە لەیادماندا بێت، ئەوەی کە ئەو وشەی «گۆرانی»یە کە لێرەدا هاتووە لە وتنی شیعردا هیچ پەیوەندییەکی بە گۆرانی واقیعی هاوچەرخەوە نییە، هەربۆیە گوتوویانە کە: «ئاسانکاری هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێت تەنیا لە وتنەوەی شیعری سەردەمی نەفامیدا بووە، کە پەند و دانایی تێدا هەیە، کە وەک شێوازی بەڕێخستنی وشتری کاروانیدا [الحُداء] بوترێتەوە، بەجۆرێک کە دڵی مرۆڤ بەلای ئارەزوودا ڕانەکێشێت، هەربۆیە تەنانەت لە مزگەوتی پێغەمبەریشدا (ﷺ) ئەوەیان دەکرد، کە هیچێک لەوە نە دڵداری تێدا بوو، نە هەڵدان بە ئافرەتاندا و تاریفکردن لە جوانییان، نە باسکردن لە مەی و ئەو شتانەی کە پەروەردگار حەرامیکردوون».

## ئەهلی مزگەوت

لێرەدا خاڵێکی کۆتایی ماوەتەوە کە بەڵێنمان دا لە کۆتایی پەڕاوەکاندا باسی لێوە بکەین تاوەکوو مەودای وابەستەبوونی «خەووات» بە مزگەوتەوە و شوێنەواری ئەو دوورکەوتنەوەیە و هەستکردنی توندی بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە لە مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) دوورکەوتەوە تێیدا بخەینەڕوو، گواستمەوە بۆ ئێرە تائەوەی زنجیرەی بیرۆکەکان نەپچڕێت لە ڕووداوی بەرەڵڵابوونی وشترەکەدا.

پێشەوا «بەغەوی» لە تۆماری ژیاننامەکەی «خەووات»دا (ڕەزای

خوای لێبێت) هێناوێتی کە «خەووات» «یەکێک بوو لەو پێنج هاوەڵەی کە سوێندیان خواردبوو هەرگیز لە بارودۆخێکدا نەمێننەوە کە تەنانەت دۆڵێکیش بکەوێتە نێوان ئەوان و پێغەمبەری خواوە (ﷺ)».

ئەم دەقە تەڕ و ناسکە پێت دەڵێت کە «خەووات» و ئەو هاوەڵانەی چەندە پەیوەستی مزگەوت بوون، کە ئەویش نیشانەی ڕاستاڵی و نزیکی و هەروەها دوورکەوتنەوە لە دونیا و ویستنی دوارۆژە.

ئەم واتایە کە لەوانەیە لای ڕاڤەکارانی پێشوو ڕوون بووبێت و ئێستە ئاوا لە ئێمە گیر بووە؛ لەپاش گەڕان بەناو ئەو سەرچاوانەی کە لەبەردەستمدا بوون نەمدی هیچ ڕاڤەکارێک مانای کردبێتەوە، خودا دەزانێت بەڵام هێندی لە ئێمە دیارە مەبەست ئەوەیە کە دراوسێیەتیکردنی پێغەمبەریان (ﷺ) پێخۆشبووە وەک لەوەی بچن و لەدووری ئەو نیشتەجێ بن.

بینیشم کە ئەم پەیوەستییە توندە تەنانەت هەتاکوو پاش وەفاتی پێغەمبەریش (ﷺ) بەردەوام بووە، جا «خەووات» دراوسێیەتی مەڵبەندی پێغەمبەری (ﷺ) پێخۆشبوو زیاد لەوەی کە بچێت و لەدووری ئەو و لە یەکێک لەو زەویانەدا کە بۆی بڕاوەتەوە نیشتەجێ ببێت، بەڵگە لەسەر ئەمە ئەوەی کە بەلاذەری لە «الفتوح» دا هێناوێتی بە سەنەدەکەیەوە لە «هیشامی کوڕی عورِوە»وە لە باوکییەوە، دەفەرمووێت: "«عومەر» زەوییەکانی عەقیقی دابەشدەکرد هەتاکوو گەشتە بەشە بڕاوەکەی «خەوواتی کوڕی جوبەیری ئەنساری» ، جا گوتی: کوان خاوەن بەشەکان [بۆ دیار نین]؟ ئەمڕۆ زەوی چاکی وەک ئەمەم نەبڕیوەتەوە!" وە گوتی: «عومەری کوڕی خەتتاب زەوییەکی مردوو [کارلێنەکراو]ی بۆ «خەوواتی کوڕی جوبەیری ئەنساری» بڕییەوە و ئێمەش لەومان کڕییەوە".

ئا بەم شێوەیە ناونران ئەهلی مزگەوت لەبەر توند پەیوەستبوونیان بە مزگەوتی پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، کە پێنج کەس بوون: «عاصیمی کوڕی

ثابیت» (ڕەزای خوای لێبێت)، یەکێک لە شەهیدە پاڵەوانەکان، ئامادەی پەیماننامەی عەقەبە بووە، هەروەها بەدر و ئوحودیش، چیرۆکێکی بەناوبانگ و کەرامەتێکی هەیە لە پاراستنی لاشەیدا بە زەردەواڵە، لە ڕۆژی ڕەجیع دا شەهیدبووە (ک ٤ک)، ئەوجا «حەنظەلەی غەسیل-شۆردراو» (ڕەزای خوای لێبێت)، چیرۆکی ئەویش ناسراوە، ئەوەی کە فریشتەکان شۆردیان، لە ئوحوددا شەهیدبوو (ک ٣ک)، هەروەها براکەشی «عبدالله ی کوڕی جوبەیر» (ڕەزای خوای لێبێت)، پاڵەوانە بەجەرگەکە، ئەمیری تیرهاوێژان، ئامادەی عەقەبە و بەدریش بووە و بە دامەزراوانە لە ئوحوددا شەهیدبوو، چەند هەڵوێستی مەزن و گەورەی هەیە کە جێگای لێڕامانن، (ک ٣ک)، هەروەها «سەهلی کوڕی حونەیف»، ئامادەی سەرجەم ڕووداوەکان بووە، لە ڕۆژی ئوحودیشدا گەلێک دلێری نوواند، تەمەنی درێژبوو هەتا ئەوەی کە گەشت بە ڕووداوی «صِفِّین»یش، نیشتەجێی کوفە بووە، (ک ٣٨)، ئەم هاوڕێیەی ئێرەشمان «خەوواتی کوڕی جوبەیر» (ڕەزای خوای لێبێت).

ئەنجام ئەوەیە کە ئەم پێنجە لە سەرەتادا مزگەوتیان کردبووە ماڵی خۆیان وەک حاڵی «ئەهلی صوففە»، صوففەش شوێنێک بوو لە بەشی دواوەی مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) لە باکووری مزگەوتەوە لە مەدینەی نەبەویدا، هەژارانێکی ناو موسڵمانان کە نە خێزان و منداڵ و نە شوێنێکیان هەبوو؛ پەنایان بۆ ئەوێ دەبرد؛ جا کاتێک بازنەی ئیسلام فراوانبوو و بڵاودەبوویەوە و خەڵک دەهاتنە ناویەوە، کۆچکەرانی بەرەو مەدینە گەلێک زۆر بوون لە هەژار و دەوڵەمەند و خێزاندار و سەڵت، جا هەرکەسێک کە پەناگەی نەبا دەچوویە ئەو صوففەیەی ناو مزگەوت، سەرجەم ئەهلی صوففەش بە یەکجار کۆنەدەبوونەوە، بەڵکوو هەندێک ژنی دێنا و دەچوو یاخود دوای ماوەیەک شوێنی دەگوێزایەوە و ئەوێی بەجێدەهێشت.

ئەوەی دەردەکەوێت ئەم پێنجە هەندێکیان هەر ئەسڵەن لە ئەهلی صوففە بووبن، وەک «حەنظەلەی غەسیل»، هەندێکیشیان چووبنە ئەوێ تەنیا لەبەر حەزکردن بە دراوسێییەتی پێغەمبەر (ﷺ)، جا کاتێکیش کە ماڵ و لانەی سەربەخۆیان بۆ گونجاوە هێشتا هەر مانەوەی مزگەوتیان هەڵبژاردووە، وە سوێندیان خواردووە کە لە هیچ بارێکدا نەمێننەوە کە تەنانەت دۆڵێکیش لە نێوان ئەوان و پێغەمبەری خوادا (ﷺ) هەبێت، جا بۆیە ناونراون ئەهلی مزگەوت، واللّٰه أعلم.

«خەووات» ماوەی جێنشینایەتی «ئەبو بەکر» و «عومەر» و «عوسمان» و عەلی ڕەزای خوایان لێبێت ژیاوە و بە ڕووداوەکانی فیتنە و ئاشووبی نێوان هاوەڵان گەشتووە و دیویەتی، و لە سووپاکەی عەلیشدا بووە.

لە منداڵیش «صالح» و «حەبیب»ی هەبووە کە دایکیان لە «بەنی ثەعلەبە» بووە.

هەروەها «سالم»، و «دایکی سالم»، و «دایکی قاسم»، کە دایکیان عومەیرەی کچی حەنظەلەی کوڕی حەبیبە. وە «داوود»، و «عەبدوڵڵا»، کە کونیەکەی بەوە بووە، هەروەها کونیەی باوکی صالحیشی هەبووە.

«خەووات» هەتا ساڵی چل ماوەتەوە و لەو ساڵەدا و لە مەدینەدا مردووە کە تەمەنی ببووە حەفتا و چوار ساڵ، وتراویشە: ساڵی چل و دوو مردووە، «خەوواتی کوڕی جوبەیر» لە مەدینەدا سەری نایەوە، خەنە و وسمەی بەکاردێنا، پیاوێکی باڵا ناوەنج بوو، هەندێک وتوویانە کە ساڵانی دوایی تەمەنیدا بینایی لەدەستداوە.

ڕەزای پەروەردگار لە ئەو و لە سەرجەم هاوەڵان، آمین.

# کۆتایی

چەندی میترۆی تەمەن بەرەوپێشم دەبات، حەقیقەتێک کە لە دەروونمدا چەقیوە، بەڵگەکانی ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر و زیاتر دەبن.

ئێمە زۆر زۆر دوورکەوتووینەتەوە!

هەر تاوێک ژیاننامەی یەک لەو پیاوە بەڕێزانە دەخوێنمەوە، و ڕۆژەکانیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چۆن بووە، مامەڵەیان لەگەڵ یەکتردا چۆن بووە، و هەروەها لەگەڵ ڕووداو و پێشهاتە یەخەگیرەکانی سەردەمی خۆیاندا؛ ئەوجا چاک چاک هۆکاری ئەم ونبوونەی کە خۆمانی تێدا دەژین دەزانم.

بەبێ بەکارهێنانی هیچ دەربڕین و دەستەواژەگەلێکی وێژەیی با بڵێم؛ ئێمە «وون دەبین» وەختێک کە لە ڕۆشناییەکە دووردەکەوینەوە، لە بنەڕەتەکە، لە بنچینەکە!

فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لە گوێمدا دەزرنگێتەوە:

«ئەستێرەکان ئاسایشن بۆ ئاسمان، خۆ ئەگەر ئەستێرەکان نەمان؛ ئەوەی هەڕەشەی لە ئاسمان کرابێت بۆی دێت، منیش ئاسایشم بۆ هاوەڵانم، وەختێکی من نەمام ئەوەی هەڕەشەی لە هاوەڵانم کراوە بۆیان دێت، هاوەڵانیشم ئاسایشن بۆ ئوممەتم، جا کە هاوەڵانم نەمان ئیدی ئەوەی هەڕەشەی کراوە لە ئوممەتم بۆیان دێت».

هاوەڵانت نەمان ئەی پێغەمبەری خوا!

ڕۆشتن و ئێمەش بێ پشت و پەنا. . بێترووسکایی. . بەبێ ئاسایش مانەوە.

تاقە چارەش ئەوەیە کە «ونبوو» بگەڕێتەوە بۆ بنەڕەتەکەی خۆی...بۆ سەرچاوەی ڕۆشناییەکە کە ڕێگەی نیشاندەدات.

تەنیا ڕێگە ئەوەیە بۆ هێنانەبوونی مرۆڤێک کە هاوسەنگانە بیربکاتەوە.

ئازادانە بدوێت ...

مرۆڤێک: «مرۆڤ»، خودا بپەرستێت، وەڵامی بانگەوازییەکەی بداتەوە، گوێڕایەڵ بێت و تاوانیشی تووشبێت، تەوبە بکات و بگەڕێتەوە، جیهادیش بکات، گاڵتەش بکات، سەرکێشی بکات، هەم خەفەتی هەبێت هەم دڵخۆشی...

شیعریشی حەز لێببێت بەبێ پەتبڕین، ئایین بەرپابکات بەبێ زێدەڕەوی، دونیانەویست، دوارۆژ پەروەر، زەوی بەپێی ڕێبازەکەی خودا ئاوەدان بکاتەوە، پشتی حەق بگرێت، ڕاستی بڵێت، چاکە بکات، ڕابمێنێت و فێربێت.

لە دواییدا: مرۆڤێک؛ هاوسەنگانە بیربکاتەوە، ئازادانە بدوێت، خۆشەویستی ببەخشێتەوە، و سەرەنجامەکانیش بێنێتە پێش چاوان.

پەروەردگارا لە ئێمە و لەو برایانەشمان خۆشبە کە بە باوەڕەوە لە پێشمان ڕۆشتن، کینەیەکیش لە دڵمان نەنێیت سەبارەت بە باوەڕداران، سبحانك اللهم وبحمدك.

أشهد أن لا إله إلا أنت، أستغفرك وأتوب إليك، والحمد لله رب العالمين.

ASTANA

ASTANA

# ناوەڕۆک




له «خەووات»ـەوە فێربووم کە هەوڵدانی بەردەوام بۆ گەشتن بە ئامانج، مانای ئەوەیە کە تۆ شایانی تووشبوون بە هەڵە -بێگومان- و لادانیت لە ڕێگەکە، و دواتر دەوەستیت و خۆت ڕاست دەکەیتەوە، و ئەوجا دووبارە دەگەڕێیتەوە سەر ئەو شاڕێگەیەی کە دەتگەیەنێت بە ئامانج.

بێگومان دەبێت تووشی گوناهـ بێیت و تەوبەش بکەیت، شکست بێنیت و سەریش بکەویت ... بکەویت و دووبارە هەستیتەوە، ئەمە سرووشتی ژیانە، ئەمە سرووشتی مرۆڤەکانە.

فێربووم کە ڕێگەی گەڕانەوە هەمیشە وابەستەی هەنگاونان و کارکردن و بێئومێد نەبوونە و هەنگاونانی بەردەوام بۆ ئەو شتەی کە دەتەوێت، بە دڵنیاییەوە هەندێک مەیل بەلای لادانیشدا ڕوودەدات. خۆ ئەگەر بڵێیت: "نەخێر هیچ مەیلێک بۆ لادان نییە..." ئەوە یان وەهم و خەیاڵە، یاخود تۆ وەستاو و نەجووڵاویت و لە شوێنی خۆت نەبزووتووی!